





# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

## سێیەم

# عوثمانی کوڕی عەفان

(رضي الله عنه)

ئامادەکردنی: فـواد تـەوحـیـدی



# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

## ــ سێیەم ــ

# عوثمانی کوڕی عەفان (رضي اللة عنة)

ئامادەکردنی: فواد تەوحیدی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرمووێت: (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالى درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەڵان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوا لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

## عوثمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه)

ناوی عوثمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی ئومەییەی قوڕەیشی ئومەویە، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڵا یان ئەبووعەمرە.

پێی دەوترا ذینورەین واتە خاوەن دوو ڕووناکیەکە، ئەمەش لەبەرئەوەی دووو کچی پێغەمبەری خوای ﷺ بەهاوسەر گرتبوو، ئەم فەزڵەش تەنها بۆ عوثمان بووە کە دوو کچی پێغەمبەرێکی خوا یەك دوای یەك بەهاوسەر بگرێت.

دایکی ناوی ئەروای کچی کورەیزە.

عوثمان شەش ساڵ پاش ساڵی فیل لەدایك بوو، واتە تەمەنی لە پێغەمبەر ﷺ کەمتر بوو.

**ژن و منداڵەکانی:** روقییەی کچی پێغەمبەر ﷺ هاوسەری عوثمانی کوڕی عەففان بوو، سەرەتا روقییە هاوسەری کوڕێکی ئەبوو لەهەب بوو کە ناوی عوتبە بوو، ئەمەش پێش ماوەی پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام کاتێك پێغەمبەر ﷺ سروشی بۆ هات و ئەبوولەهەب دژایەتی کرد، فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا روقییە تەڵآق بدات، ئەوکات هێشتا روقییە نەگوازرابوویەوە، ئەوەبوو تەڵآقی دا، دواتر عوثمانی کوڕی عەففان روقییەی بەهاوسەر گرت و لەگەڵیدا خۆشی و ناخۆشیەکانی بەشکرد، پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو پێکەوە گەڕانەوەو کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لە مەدینەش تا وەفاتی روقییە عوثمان هەر لە لای روقییە بوو.

روقییە لە عوثمانی کوڕی عەففان کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا، بەڵام ئەو کوڕەی مرد و ئیتر دوای ئەوە روقییە منداڵی تری نەبوو، عەبدوڵای کوڕی تەمەنی گەیشتبوویە شەش ساڵان کە کەڵەشێرێك دەنووکی دا لە دەموچاوی و مرد.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ غەزای بەدر روقییە نەخۆش بوو، بۆیە عوثمانی کوڕی عەففان لای روقییەی خێزانی مایەوە، ئەو رۆژەی زەیدی نێردراوی پێغەمبەر ﷺ بە موژدەوە هاتەوە بەرەو مەدینە تا هەواڵی سەرکەوتنی بەدر بدات روقییە کۆچی دوایی کرد.

ئوموکلثومی کچی پێغەمبەر ﷺ کە لە روقییەی خوشکی بچووکتر بوو و دوای مردنی روقییەی خوشکی، پێغەمبەر ﷺ ئەوی مارە کرد لە عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵام ئەمیش لە ساڵی نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد و باوکی (پێغەمبەری ئازیز ﷺ نوێژی لەسەر کرد.

ژنێکی تری پاش وەفاتی هەردوو کچی پێغەمبەر ﷺ ناوی فاخیتەی کچی غەزوان بوو کە عەبدوڵا ئەصغەری لێ بوو، ژنێکی تری ناوی ئوموعەمری کچی جوندوب بوو کە عەمر و خالید و ئەبان و عومەر و مەریەمی لێ بوو، ژنێکی تری ناوی فاتیمەی کچی وەلید بوو کە سەعید و ئوموسەعیدی لێ بوو، ژنێکی تری ناوی ئومولبەنین بوو کە عەبدولملیکی لێ بوو، ژنێکی تری ناوی رەملەی کچی شەیبە بوو کە عائیشەو ئوموئەبان و ئومو عەمری لێ بوو، ژنێکی تری ناوی

نائیلە بوو کە مەریەمی لێ بوو، لە ئوم وەلەدێك کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممولبەنین.

سەعیدی کوڕی عاص زاوای عوثمانی کوڕی عەففان بوو و دوو کچی عوثمان یەك دوای یەك هاوسەری ئەو بوون کە بریتی بوون لە ئوممو‌عمر و مەریەمە.

سەعید لە ماوەی والیەتی لە کووفە هێرشی بردە سەر طەبەرستان و فەتحی کرد، هێرشیشی بردە سەر جورجان، گەورە هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ لەناو سوپاکەیدا بوون.

سەعید پاش پێنج ساڵ والیەتی کووفە گەڕایەوە بۆ مەدینەو لەو کاتەی ماڵەکەی عوثمانی کوڕی عەففان گەمارۆ درا، سەعید لە ماڵی خەلیفە بوو و بەرگری لێدەکرد.

**موسڵمان بوونی:** عوثمانی کوڕی عەففان لە ڕێی ئەبووبەکری صدیقەوە موسڵمان بوو، کاتێك ئەبووبەکر موسڵمان بوو یەکەم هەنگاوی ئەوەبوو چوو بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، هەموو ئەوانە موسڵمان بوون.

هەریەك لە عوثمانی کوڕی عەففان و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا بە دوای زوبەیری کوڕی عەووامدا چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش باسی ئیسلامی بۆ کردن و قورئانی خوێندەوە بۆیان و مافەکانی ئیسلام و بەڵێنی ڕێزداری لەلایەن خواوەی بۆ خستنەڕوو، ئەوانیش باوەڕیان هێنا.

حەکەمی کوڕی ئەبیلعاص کە مامی عوثمانی کوڕی عەففان بوو، کاتێك زانی عوثمان موسڵمان بووە بەرامبەر بە عوثمان توندی و خراپەی زۆری نواند، کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان موسڵمان بوو، حەکەم کە مامی بوو عوثمانی گرت و بە گوریس بەستیەوەو وتی

سوێند بەخوا تا نەگەڕێیتەوە سەر ئایینی باوباپرانت ناتکەمەوە، عوثمانیش وتی سوێند بەخوا هەرگیز وازی لێ ناهێنم، کاتێك حەکەم بینی عوثمان زۆر سوورە لەسەر ئایینەکەی وازی لێهێنا و بەریدا.

کۆچکردن بۆ حەبەشە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیدا لە یەکەم کۆچی حەبەشەدا کە یانزە پیاو و چوار ئافرەت بوون- بە گێڕانەوەی تر هەشتاو دوو پیاو جگە لە ژنەکان، هەموویان کەشتیەکیان بە کرێ گرت بۆ حەبەشە، عوثمانی کوڕی عەففان هاودەم بە ڕوقییەی خێزانی کە کچی پێغەمبەر ﷺ بوو کۆچیان کرد بۆ حەبەشە.

کاتێك عوثمان و ڕوقییە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك هەواڵی ئەوانی نەزانی، بۆیە هەوڵی دەدا هەواڵیان بزانێت، ئافرەتێك هات بۆ لای و هەواڵی عوثمان و ڕوقییەی پێ بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن عثمان أول من هاجر إلى الله بأهله بعد لوط، عوثمان یەکەم کەسە دوای پێغەمبەر لووط لەپێناو خوادا بە ژنیەوە کۆچی کردبێت).

دواتر هەواڵێك بیسترا کە بێباوەڕانی مەككە موسڵمان بون، بۆیە عوثمان هاودەم بە روقییەو ژمارەیەكی تر گەڕانەوە بۆ مەككە.
كۆچكردن بۆ مەدینە كاتێ موسڵمانان كۆچیان كرد بۆ مەدینە عوثمانی كوڕی عەففان لە ماڵی ئەوسی كوڕی ثابت دابەزی و لەوێ مایەوە، دواتریش پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان ئەو دوانەوە.
لە جەنگی بەدردا ئوسامە نەچوو بۆ جەنگەكە و لەگەڵ عوثمانی كوڕی عەففاندا مایەوە، بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ هەریەك لە عوثمان و ئوسامە لای روقییە مانەوە، كاتێ روقییەی كچی پێغەمبەر ﷺ و خێزانی عوثمانی كوڕی عەففان وەفاتی كرد، ئوسامە لەگەڵ عوثماندا سەرقاڵ بوو بە ئەسپەردەكردنی تەرمی روقییەوە، لەو كاتەدا عوثمان دەنگی الله أكبری بیست، وتی ئوسامە ئەوە چیە؟
كە چوون سەیریان كرد زەیدی باوكی ئوسامەیە موژدەی شكستی بێباوەرانی هێناوە.

کاتێك ڕوقییە وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الحقي بسلفنا عثمان بن مظعون)، (پەیوەست بە بە پێشینمان عوثمانی کوڕی مەظعوون)،

پێشتر کە عوثمانی کوڕی مەظعوون وەفاتی کردبوو، ژنەکەی وتی بەهەشتت لێ پیرۆز بێت، پێغەمبەر ﷺ بە توورەییەوە تەماشای کرد و فەرمووی: تۆ چووزانیت؟

ئەویش وتی ئەو سوارچاك و هاوەڵی تۆ بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سوێند بەخوا نازانم چی پێ دەکرێت)، ئیتر هاوەڵان ئەوەیان زۆر لەسەر سەخت بوو کە چۆن پێغەمبەر ﷺ بۆ عوثمان وای فەرموو، بەڵام کاتێك ڕوقییە مرد و پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو ئیتر هاوەڵان تێگەیشتن.

لە غەزای ئوحوددا عوثمان بەشداری کرد، بەڵام کاتێك موسڵمانان بلآوەیان لێکرد، عوثمانیش یەکێك بوو لەوانە، دواتر خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە کە لێیان خۆش بووە، بەڵام نەیارەکانی عوثمان ئەوەیان کرد بە تانەیەك لەسەری.

لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ غەزای نەجد و عوثمانی کوڕی عەففانی وەك بەرپرسی مەدینە دانا، ماوەی یانزە ڕۆژ عوثمان بەرپرسی مەدینە بوو تا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە.

کاتێك حەفصەی کچی عومەر بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عوثمان، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێك لە بێتاقەتی ڕوی تێکرد و چوو لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای کرد کە چی ڕوویداوە، ئەویش فەرمووی: (يتزوج حفصة من هو خير من عثمان و يتزوج عثمان من هي خير من حفصة)، (کەسی باشتر لە عوثمان حەفصە بەهاوسەر دەگرێت و عوثمانیش کەسی باشتر لە حەفصە بەهاوسەر دەگرێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺداوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی وتی دڵت شتێك نەکات بەرامبەرم،

من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە – ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم با نهێنی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر ﷺ حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.

هەر لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا بوو پێغەمبەر ﷺ ئوممو کلثومیشی لە عوثمانی کوڕی عەففان مارە کرد، لە مانگی جومادیلئاخیرەی هەمان ساڵدا گواستیەوە.

لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا عەبدوڵای کوڕی عوثمان کە لە روقییەی کچی پێغەمبەر ﷺ بوو و تەمەنی نزیکەی حەوت ساڵان دەبوو کۆچی دوایی کرد و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد، عوثمان خۆی دابەزیە ناو گۆڕەکەیەوە.

رێککەوتنی حودەیبیە کاتێ موسڵمانان بە هاودەمی پێغەمبەر ﷺ بەرێکەوتن بۆ عومرە و بێباوەڕان بەریان پێگرتن، پێغەمبەر ﷺ عوثمانی کوڕی عەففانی نارد تا بچێت بۆ مەککە و لەگەڵ بێباوەڕاندا وتووێژ بکات،

کاتێ عوثمان چوو بۆ مەککە ئەبان پەنای داو بەرپرسیارێتی پاراستنی عوثمانی گرتە ئەستۆی خۆی و عوثمانی سواری ئەسپەکەی خۆی کرد و وتی بە بێترس بە کوێی مەککەدا دەگەڕێیت بگەڕێ.

عوثمانیش چوو و ئەبووسوفیان و قوڕەیشیەکانی دواند و پەیامی پێغەمبەری خوای ﷺ بەوان گەیاند، ئەوانیش وتیان خۆت دەتوانیت تەواف بکەیت، ئەویش وتی تا پێغەمبەر ﷺ تەواف نەکات من تەواف ناکەم، ئینجا قوڕەیشیەکان عوثمانیان لەوێ دەستبەسەر کرد، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان کە عوثمان کوژراوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری تۆڵەی دا و موسڵمانانی بانگهێشت کرد بۆ بەیعەتدان کە ناسراوە بە بەیعەتی ریضوان.

بەیعەتی ریضوان لە سەروبەندی رێککەوتنی حودەیبیەدا بوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵان ویستی بچن بۆ عەمرە و بێباوەرانی قورەیش رێیان پێگرتن، بۆ دواندنی بێباوەڕان پێغەمبەر ﷺ عوثمانی کوڕی عەففانی نارد بۆ ناو قورەیش، بەڵام دەنگۆ بڵاو بوویەوە کە عوثمانیان شەهید کردووە،

بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە بن درەختی ئەو شوێنەی تیایدا مابوونەوە داوای لە هاوەڵان کرد بێن و بەیعەت بدەن، هاوەڵانیش چوون بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە بری عوثمان دەستەکەی تری خۆی خستە دەستی و لە بریدا بەیعەتی دا، خوای گەورەش شایەتی راستگۆیی پێدان و ئایەتی لەسەر دابەزاند: (لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة) پێغەمبەر ﷺ لە فەتحی مەککەدا لێخۆشبوونی بۆ هەندێ کەس بە رەوا دانەنا، یەکێك لەوانە عەبدوڵای کوڕی سەعد بوو کە دەبوو لە هەر کوێ بینرا بکوژرێت، عەبدوڵایش چوو لای عوثمانی کوڕی عەففان خۆی شاردەوە، عوثمان ئەوی هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەت لە عەبدوڵا وەربگرە، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوەو سێ جار تەماشای کرد و هەر جارە ئامادە نەبوو بەیعەتی لێ وەربگرێت، دواتر بەیعەتی لێ وەرگرت، دواتر پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو (ئەرێ پیاوماقووڵێکتان-ژیرێکتان- تێدا نەبووکە منی بینی بەیعەتی لێ وەرناگرم هەستێت بیکوژێت؟)

هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چووزانین نیازی دڵی تۆ چیە؟ با بە چاو ئاماژەیەکت بکردایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بۆ پێغەمبەرێك شیاو نیە چاوی ناپاکی هەبێت).

پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتەکانی هەوەزاندا کەنیزەکێکی بەخشی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە ناوی رەیطەی کچی هیلال بوو، کەنیزەیەکیشی بەخشی بە عوثمانی کوڕی عەففان کە ناوی زەینەبی کچی حەییان بوو.

زەید دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەیفەرموو فلآنە کەس لە کوێیە؟ بەردەوام هەواڵی یەکەیەکەیانی دەپرسی و دەینارد بە شوێنیاندا تا هەموویان هاتن و کۆبوونەوە، ئینجا فەرمووی: (إني أحدثكم بحديث فاحفظوه وعوه وحدثوا به من بعدكم، إن الله عز وجل اصطفى من خلقه خلقا، ثم تلا هذه الآية الله يصطفي من الملائكة رسلا ومن الناس خلقا يدخلهم الجنة، وإني مصطف منكم من أحب أن أصطفيه ومواخي بينكما كما آخى الله عز وجل بين الملائكة عليهم السلام)، (من قسەیەکتان بۆ دەکەم جوان وەریبگرن و لەبیرتان بمێنێت

و لێی تێبگەن و بیگەیەنن بەوانەی دوای خۆتان، خوای گەورە لە دروستکراوەکانی دەستەیەکی هەڵبژاردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (الله يصطفي من الملائكة رسلا و من الناس)، منیش لەنێوتاندا ئەوانە هەڵدەبژێرم کە حەز دەکەم هەڵیبژێرم، برایەتی دەخەمە نێوانتانەوە وەك چۆن خوای گەورە برایەتی خستە نێوان فریشتەکانەوە)، پاشان هەریەك لە ئەبووبەکر و عومەری بەدوای یەکدا بانگ کرد و تایبەتمەندی هەرکامیانی فەرموو و ئەوانی کرد بە برای یەکدی، عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و پێی ڕاگەیاند کە تووشی چ نارەحەتیەك دەبێت، پاشان عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کرد و باسی بەخشندەییەکەی عەبدوڕەحمانی کرد، پاشان طهلحەو زوبەیری بانگ کرد و هەردووکیانی کرد بە برای یەکدی، پاشان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەممای کوڕی یاسری بانگ کرد و هەردووکیانی کرد بە برای یەکدی، پاشان عوەیمیر و سەلمانی فارسی بانگ کرد و ئەوانیشی کرد بە برای یەکدی، دواتر موژدەی حەوزی کەوسەری دا بە هاوەڵانی...

عەلی کوڕی ئەبووطالیب هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گیانم دەرچوو و پشتم شکا کاتێك دەبینم لەگەڵ هاوەڵانت وات فەرمووە من نەبێت کە هیچت پێ نەفەرمووم، ئەگەر لە تووڕەییەوەیە ئەوە سزا و ڕێزداریش هەر بۆ جەنابتە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سوێند بەوەی منی بە حەق ناردووە تۆم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، تۆ بۆ من وەك پێگەی هاروون بۆ مووسا وایت، تەنها هێندە هەیە دوای من هیچ پێغەمبەرێکی تر نیە، بۆیە تۆ برا و میراتگری منیت)، عەلی وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ چی لە تۆ بە میرات دەگرم؟ فەرمووی: (ئەوەی پێش تۆ پێغەمبەران بە میراتیان گرتووە، کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکەیان، تۆ براو هاودەمی منیت).

پێغەمبەر ﷺ کە ویستی غەزای تەبووك بکات، داوای کرد خەڵکێك کۆمەکی ماددی پێشکەش بکەن تا پێداویستیەکانی جەنگ ئامادە بکرێن بۆ موسڵمانان، ئەوەبوو عوثمانی کوڕی عەففان لە هەموو کەسێك زیاتری بەخشی.

عەبدورەحمان دەڵێت لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم کە خەڵکی هاندەدا تا هاوکار بن بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی سوپای تەبووك، عوثمانی کوڕی عەففان هەستاو وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووسەد وشتر بە شمەکەکانیەوە لە ڕێی خوادا لەسەر من، دواتر پێغەمبەر ﷺ هەمدی خەڵکی هاندەدا، عوثمان هەمدی هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووسەد وشتر بە هەموو شمەکەکانیەوە لەرێی خوادا لەسەر من، هەمدی پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هاندەدا، عوثمان هەمدی هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سێ سەد وشتر بە هەموو پێداویستیەکانیەوە لە ڕێی خوادا لەسەر من، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر مینبەرەکە دادەبەزی و دەیفەرموو: (ما على عثمان ما عمل بعد هذه، ماعلى عثمان ما عمل بعد هذه)، (دوای ئەمە عوثمان هەرچی بکات لەسەری نیە، دوای ئەمە عوثمان هەرچی بکات لەسەری نیە). عوثمانی کوڕی عەففان هەندێ جار نامەی دەنووسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەبوو کاتێك وەفدی کینانە هاتن و پێغەمبەر ﷺ نووسراوێکی بۆ نووسین،

عوثمانی کوڕی عففان نووسراوەکەی نووسی.

عائیشە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی نارد بۆ عوثمانی کوڕی عەففان و ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دواتر کۆتا وتەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە دای بەسەر شانی عوثماندا و پێی فەرموو: (يا عثمان، إن الله عز وجل عسى أن يلبسك قميصا، فإن أرادك المنافقون على خلعه، فلا تخلعه حتى تلقاني، يا عثمان، إن الله عسى أن يلبسك قميصا، فإن أرادك المنافقون على خلعه، فلا تخلعه حتى تلقاني)، (ئەی عوثمان، لەوانەیە خوای گەورە جلێکت بەبەردا بکات، جا ئەگەر دووڕووەکان ویستیان لایبەرن لایمەبە تا دەگەیتەوە پێم، سێ جار ئەوەی پێ فەرموو). مەبەست بەو جلە خیلافەتێك بوو کە خوا پێی بەخشی و دووڕووەکانیش ئەو ئاشووبگێڕانە بوون کە ویستیان لە خیلافەتەکەی لایبەرن، دواجاریش شەهیدیان کرد.

## عوثمان لە موژدەپێدراوانی بەهەشتە

عوثمانی کوڕی عەففان یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد في الجنة، وسعيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة)، (ئەبووبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوثمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، طەلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتە). رۆژێك موغیرە لای سەعیدی کوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في الجنة، والزبير بن العوام في الجنة،

وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)، (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەبووبەکر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طهلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری کوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیلێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی. جارێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی حیرء وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئارام بگرە حیرء، چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە یان پێغەمبەرە یان صدیقە یان شەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەك لە پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و طەلحەو زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەسەر کێوەکە بوون.

زەید دەڵێت جارێك پێغەمبەر ﷺ منی نارد و فەرمووی (بڕۆ بۆ لای ئەبووبەکر دەبینیت لە ماڵی خۆیەو لەسەر کۆش دانیشتووەو خۆی کۆکردوەتەوە، پێی بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لێ دەکات و پێت دەفەرمویت موژدەی بەهەشتت لێ بێت، پاشان بڕۆ تا دەگەیتە ثهنییە و لەوێ دەگەیت بە عومەر لەسەر گوێدرێژێکەو رووتاوەی سەری دەرکەوتووە، پێی بڵێ پێغەمبەر ﷺ سەلامت لێ دەکات و دەفەرمویت موژدەی بەهەشتت لێ بێت، ئینجا بڕۆ تا دەچیتە بازاڕ و دەگەیت بە عوثمان کە تیایدا کڕین و فرۆش دەکات، پێی بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لێ دەکات و دەفەرمویت موژدەی بەهەشتت لێ بێت پاش نارەحەتیەکی سەخت، منیش چووم و هەموو ئەو شتانەم بینی و فەرمانی پێغەمبەری خوام ﷺ بەجێگەیاند، بە هەرکامم دەوت ئەویش دەیوت ئەی پێغەمبەر ﷺ لەکوێیە؟

منیش دەموت لە فلآنە شوێنە، هەموان لەگەڵم هاتن تا چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عوثمان وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەید هاتووە بۆ لام و پاش گەیاندنی سەلامی تۆ وتی پێغەمبەر ﷺ

فەرموویەتی: (موژدەی بەهەشتت لێ بێت پاش نارەحەتیەکی سەخت)، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ بەڵایەکم دێتەرێ؟ سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە گۆرانیم نەوتووەو نیازو خواستم نەبووەو دەستی راستم نەداوە لە دوایێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئائەوەیە).

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا کە باس لە فەزڵی هاوەڵانێکی دەکات دەفەرموێت (أرحم أمتي بها ابو بكر وأقواهم في دين الله عمر وأصدقهم حياء عثمان وأقضاهم على بن أبي طالب وأفرضهم زيد وأقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح وأبو هريرة وعاء) (بە رەحمترینی ئوممەتم بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرەو بەهێزترینیان لە ئایینی خوادا عومەرەو بە شەرمترینیان عوثمانە و دادوەرترینیان عەلی کوری ئەبووطالیبەو شارەزاترینیان بە فەرزەکان زەیدە و شارەزاترینیان بە قورئان خوێندنەوە ئوبەی کورِی کەعبە و شارەزاترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کورِی جەبەلەو ئەمینداری ئەم ئوممەتەش ئەبوو عوبەیدەی کورِی جەراحە و ئەبوو هورەیرەش قاپ و جامێکە).

حەفصە دەڵێت رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە بوو و جلەکەی خستبووە نێوان رانەکانی، ئەوەبوو ئەبووبەکر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی پێدراو هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ هەروەك خۆی مایەوەو خۆی تێکنەدا، ئینجا عومەریش هات و هەمان شت روویدا، ئینجا عەلی هات و هەمان شت روویدا، ئینجا هاوەڵانێکی تر هاتن و پێغەمبەر ﷺ هیچ خۆی تێکنەدا و هەر لەو شێوەی خۆیدا مایەوە، ئینجا عوثمان هات و داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدرا تا بێتەژوورەوە، خێرا پێغەمبەر ﷺ جلەکانی رێککرد، ئینجا کەوتنە قسەکردن و پاش ماوەیەك خەڵکەکە چوون، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبووبەکر و عومەری و عەلی و ئەو هاوەڵانەی تر هاتن تۆ هیچ خۆت تێکنەدا، کەچی کە عوثمان هات خێرا خۆت کۆکردەوەو جلەکانت رێککرد، ئەویش فەرمووی: (ألا أستحيي ممن تستحيي منه الملائكة).(ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتە شەرمی لێ دەکات).

## عوثمان لە سەردەمی ئەبووبەکردا

عوثمان لە سەردەمی ئەبووبەکردا کەسی نزیکی خەلیفە بوو و خەلیفەش لە ئەرکە گرنگەکاندا رایدەسپارد، ئەوەبوو کاتێك چوو پێشەنگی حەجی کرد بۆ موسڵمانان، عوثمانی وەك بەرپرسی مەدینە دانا تا خۆی دەگەڕێتەوە. لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا خەڵکی تووشی وشکەساڵیەکی سەخت بوون و خەڵکەکە چوون بۆ لای ئەبووبەکر و سکالآی حاڵیان کرد، ئەویش وتی خۆڕاگر بن خوا دەرووتان لێ دەکاتەوە، هێندەی نەبرد کاروانێکی عوثمان لە شامەوە گەڕایەوەو باری سەد وشتر گەنمی پێ بوو، خەڵکی چوونە بەردەم ماڵی عوثمان و دایان لە دەرگای و عوثمانیش هات بۆ لایان، وتی چیتان دەوێت؟ وتیان وشکەساڵیەو بەڵکو ئەو بارەی بۆت هاتووە پێمان بفرۆشیت تا باری هەژارانی موسڵمانان چاك بێت، عوثمان وتی بە رێز و خۆشەویستیەوە، وەرنە ژوورەوەو بکڕن، خواردنێکی زۆر لە ماڵی عوثماندا بوو، عوثمان وتی ئەی بازرگانان چەند قازانجم پێ دەدەن بۆ

ئەم کڕینە؟ وتیان دە بە دوانزە، عوثمان وتی زیاتریان پێ داوم، وتیان دە بە چواردە، وتی زیاتریان پێداوم، وتیان دە بە پانزە، وتی زیاتریان پێ داوم، بازرگانەکان وتیان ئەی ئەبووعەمر ئێمە هەموو بازرگانەکانی مەدینەین، ئیتر کێ زیاتری پێداویت؟ ئەویش وتی خوای گەورە بۆ هەر درهەمێك دە درهەمم پێ دەبەخشێت؟ ئەوە لەوە زیاترتان پێ دەدرێت؟ وتیان ناوەڵآ، عوثمان وتی دەی خوا بە شایەت دەگرم ئەم خواردنەم کرد بە خێر بۆ هەژارانی موسڵمانان.

لە مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا ئەبووبەکری صدیق تووشی نەخۆشی بوو و ماوەی نزیکەی پانزە رۆژ نەخۆشیەکەی بەردەوام بوو، لەو ماوەدا عومەری کوڕی خەططاب بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، لەو ماوەدا ئەبووبەکری صدیق عومەری کوڕی خەططابی بۆ جێگرتنەوەی خۆی دیاری کرد و عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و داوای لێکرد بە نووسراوێك ئەوە بنووسێت، ئینجا نووسراوەکە خوێنرایەوە بەسەر موسڵماناندا و ئەوانیش رازی بوون.

## عوثمان لە سەردەمی عومەردا

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابیشدا عوثمان کەسی نزیکی خەلیفە بوو و خەلیفە لە پرسە گرنگەکاندا راوێژی پێ دەکرد وەك چۆن لە فتووحاتی عێراقدا راوێژی پێکرد، هەروەها لە فەتحی بەیتولمەقدیسدا کە خەلیفە ویستی خۆی بچێت بۆ ئەوێ، رای خەڵکی وەرگرت و لەو نێوەندەدا رای عوثمانیشی وەرگرت، عوثمان رای خۆی پێشکەش بە خەلیفە کرد کە نەچێت بۆ لایان، عەلی کوڕی ئەبوو طالیبش راوێژی خۆی پێشکەش کرد کە بچێت بۆ لایان، عومەریش راکەی عەلی وەرگرت و چوو.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێت لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا جارێك لە مزگەوتدا دام بە لای عوثمانی کوڕی عەففاندا، ئەویش بە تەواوی چاوی بڕیبووە من، سەلامم لێکرد کەچی وەڵامی نەدامەوە، منیش چووم بۆ لای عومەر و سکاڵآم لا کرد و وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا هیچ گۆڕانکاریەك لە ئیسلامدا

روویداوە؟ دوو جار ئەوەم پێ وت، ئەویش وتی نا، بەڵام بۆچی؟ وتم هیچ، تەنها هێندە هەیە من کەمێك پێش ئێستا لە مزگەوتدا دام بە لای عوثماندا و سەلامم لێکرد، چاوی بڕیبووە من کەچی وەڵامی نەدامەوە، عومەر ناردی بە شوێن عوثماندا و عوثمان هات، عومەر وتی بۆچی سەلامی براکەتت وەڵام نەداوەتەوە؟ عوثمان وتی شتی وام نەکردووە، سەعد وتی با واتکرد، عوثمان سوێندی خوارد شتی وانەبووەو منیش سوێندم خوارد شتی وا بووە، دواتر عوثمان بارەکەی بیر کەوتەوەو وتی بەڵێ وایە، خوایە لێم خۆش بە، تۆ کەمێك پێش ئێستا دات بەلامدا، لەو کاتەدا من لە خەیاڵی فەرموودەیەکدا بووم کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستبوو، سوێند بەخوا هەرکات بیرم دەکەوێتەوە چاو و دڵم بە پەردەیەك دادەپۆشرێت، منیش وتم دەی من فەرموودەکەت بۆ دەگێڕمەوە، پێغەمبەر ﷺ باسی یەکەم نزای بۆ کردین، دەشتەکیەك هات بۆ لای و سەرقاڵی کرد، پێغەمبەر ﷺ هەستا، منیش شوێنی کەوتم و هەوڵم دەدا پێشم نەکەوێت، کەچی پێشم کەوت، کە ویستی بچێتەژوورەوە، بە توندی پێم کوتا بە زەویدا،

پێغەمبەر ﷺ لایکردەوە بە لامدا و فەرمووی ئەوە کێیە؟ ئەبووئیسحاقە؟ وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەی بۆ وا؟ وتم بەخوا تەنها لەبەرئەوەی تۆ باسی یەکەم نزات بۆ کردین، ئەم کابرا هات و سەرقاڵی کردیت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (نعم دعوة ذي النون إذ هو في بطن الحوت: لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين فإنه لم يدع بها مسلم ربه في شيء قط إلا استجاب له)، (بەڵێ، نزاکەی ذیننوون کە لە سکی حووتدا بوو نزای کرد (لا اله الا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين)، هەر موسڵمانێك بەو نزایە لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە خوا نزاکەی وەڵام دەداتەوە).

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب کۆچی دوایی کرد، هەریەك لە سەعید و عوثمانی کوڕی عەففان و صوهەیب و ئیبن عومەر دابەزینە ناو گۆڕەکەیەوە.

بوون بە خەلیفە عومەری کوڕی خەططاب پاش ئەوەی پێکرا، شەش کەسی راسپارد تا لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن بۆ خیلافەت، ئەوانیش بریتی بوون لە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب،

عوثمانی کوڕی عەففان، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، زوبەیری کوڕی عەووام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف. عومەری کوڕی خەططاب ئەگەری دانا بۆ درووستبوونی راجیایی لەسەر دیاریکردنی کەسێك و چارەسەری بۆ داناو وتی ئەگەر سێ کەس سێ کەوتن (واتە بوون بە دوو بەشەوە) ئەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکەن بە دادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو رازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی تێدایە.

ئەوەبوو دواجار سیانیان وازیان هێنا لە مافەکەیان بۆ ئەوانی تر، مانەوە سەر عەبدوڕەحمان و عەلی و عوثمان، عەبدوڕەحمان وتی منیش لە پێناو خوادا واز لە مافەکەم دێنم و ئێوەش یەکێکتان وازبهێنن تا بەیعەت بدەین بەوی تر، دواجار ئەهلی شوورا بڕیاری کۆتاییان دایە دەست عەبدوڕەحمان، ئەویش کەوتە وەرگرتنی رای خەڵکی و تەنانەت رای ژن و منداڵیشی وەرگرت، رای سوارەو پیادەکانیشی وەرگرت، سێ شەو و رۆژ بەردەوام بوو لەو راوەرگرتنەی، رای زۆرینەی

هەرەزۆر لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان بوو، دواجار لەبەری بەیاندا مێزەرەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردە سەر و ناردی بە شوێن ناودارانی ناو کۆچەران و پشتیوانان و خەڵکی ترداو مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ و ماوەیەکی زۆر وەستا و بە دەنگی نزم نزایەکی زۆری کرد، دواتر خەڵکەکەی دواند، ئینجا عەلی بانگ کرد و دەستی گرت و وتی لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی و کرداری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەیت؟ وتی ناوەڵاّ، بەڵکو هێندەی توانام هەبێت، عەبدوڕەحمان دەستی بەردا و عوثمانی بانگ کرد و دەستی گرت و هەمان شتی بەویش وت، عوثمان وتی بەڵێ بەخوا، ئەوەبوو عەبدوڕەحمان لە شوێنەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و عوثمانیش لە پلیکانەی خوارترەوەو خەڵکەکە هاتن بەیعەتیان دا بە عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش بەیعەتی پێدا.

جا بڕێك دەق هاتون کە عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەو بڕیارە نارازی بووبیت و ئەوەی بە فێڵ دانابێت، ئیبن کەثیر دەڵێت: (ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسانی وەك ئیبن جەریر و کەسانێکی تر لە بڕێك کەسی نەناسراوەوە تۆماریان کردووە گوایە عەلی بە عەبدوڕەحمانی وتووە تۆ منت خەڵەتاند و تۆ لەبەر خزمایەتی و لەپێناو ئەوە عوثمانت دانا تا لە هەموو شتێکدا رات وەربگرێت و... هەموو ئەمانە پێچەوانەی تۆماری صەحیح و دروستن و دەدرێنەوە بە رووی خاوەنەکانیاندا).

ماوەی خیلافەتی لە رۆژی یەکشەممەی ساڵی بیست و چواری کۆچیدا عومەری کوڕی خەططاب کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی ئەسپەردە کرا، سێ رۆژ دوای ئەوە بەیعەت درا بە عوثمانی کوڕی عەففان.

## گرتنە دەستی خەلیفایتی عوثمانی کوڕی عەففان

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە کە عوثمانی کوڕی عەففان نووسراوێکی نووسی تا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دوای خۆی ببێت بە خەلیفە، کاتێك عەبدوڕەحمان ئەوەی بیست چوویە نێوان مینبەرو گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ و نزای کرد خوایە ئەگەر بڕیاری وا هەیە ئەوا پێش ئەو بارە بممرێنە، ئەوەبوو شەش مانگی نەخایاند کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وەفاتی کرد، یەکەم نوێژ کە عوثمانی کوڕی عەففان بۆ موسڵمانانی کرد نوێژی عەسر بوو.

لە دوای نوێژی عەسر عوثمان چوویە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ و وتارێکی پێشکەش کرد و تیایدا هانی موسڵمانانی دا کاری چاکە بکەن و بزانن مەرگ لەپێشیانەو قیامەت پێش دنیا بخەن و لە خشتە نەچن و پەند لە مەرگی پێشینان وەربگرن و بێئاگا نەبن، ئینجا خەڵکی دەچون و بەیعەتیان پێدەدا.

دواتر نامەی نووسی بۆ هەموو بەرپرسانی لە ناوچەکانی وڵات و فەرمانی دەکرد کاری چاکە بکەن و خۆ دوور بگرن لە خراپە، هانی دەدان تا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن و شوێنکەوتە بن نەك موبتەدیع، پاش ماوەیەك عوثمان کەوتە گۆڕانکاری لە هەندێ پۆستدا و هەندێ لە والیەکانی گۆڕی، لەوانە موغیرەی کوڕی شوعبەی لەسەر والیەتی کووفە لابرد و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی دانا، ئەمەش لەبەر وەسیەتی عومەری کوڕی خەططاب کە داوای کردبوو خەلیفەی دوای خۆی ئەرکی پێ بسپێرێت چونکە کەسێکی پاك و لێهاتووە، دواتریش سەعدی لابرد و وەلیدی کوڕی عوقبەی دانا کە ئەوەش بوو بە تانەیەك لەسەری.

لە ماوەی خیلافەتی عوثماندا فتووحات بەردەوام بوو، چ لە بەرەی ڕۆژهەلآت و چ لە بەرەی ڕۆژئاوایشەوە، تیایدا رووبەرێکی زۆری ئەفریقیا فەتح کرا، بەتایبەت لە جەنگی جەرجیردا کە گەورە هاوەڵانیش تیایدا بەشدار بوون و بەربەرەکان شکستێکی زۆریان خوارد، هەر لەم سەردەمەو لە ساڵی بیست و هەشتی کۆچیدا بۆ

یەکەمجار سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان جەنگی دەریایی کرد و تیایدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا.

هەروەها لە ساڵی بیست و شەشی کۆچیدا خەلیفە عوثمان فەرمانی کرد بە فراوانکردنی مەسجیدولحەرام، جارێکی دیکەش حەرەمی فراوان کرد.

لە ساڵی سی کۆچیدا بوو کە خاتەمەکەی پێغەمبەر ﷺ لە دەستی عوثمانی کوڕی عەففان کەوتە ناو بیری ئەریسەوە و هەرچەندە هەوڵ درا ئەو خاتەمە بدۆزرێتەوە کەچی نەدۆزرایەوە، بۆیە عوثمان خاتەمێکی زیوی لەسەر هەمان شێوە دروست کرد.

## سەرهەڵدانی فیتنە

لە ساڵی سی و چواری کۆچیەوە سەرەتاکانی فیتنە دەرکەوتن کاتێك دەستەیەك کەوتنە رەخنەگرتن لە عوثمانی کوڕی عەفان، سەرەتای رەخنەکەیان ئەوەبوو وتیان ئەو هاوەڵانێکی زۆری لە پۆستەکاندا لابردووەو کەسانی ئومەوی لە شوێنیاندا داناوە، ئەویش ئەو قسەی زۆر لا سەخت بوو و ناردی بە شوێن والی ناوچەکاندا و هەموو هاتن بۆ لای، لەوانە موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی سەعد و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی عامیر، لەو بارەوە رای ئەوانی وەرگرت، هەریەکەو رایەکی دەربڕی، عوثمانیش والیەکانی هێشتەوەو هەوڵیدا کەسە نارەزاکانیش بە جیهادەوە سەرقاڵ بکات، هۆکاری سەرەکی ئەم بەزمانەش کابرایەکی جوولەکە بوو بە ناوی عەبدوڵای کوڕی سەبەء کە وای نیشان دابوو موسڵمان بووە، ئینجا چوویە میصر و لەوێ فیتنەیەکی نایەوەو گومانی بۆ خەڵکەکە دروست دەکرد.

کورتەی وتەکەی ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کردووە بۆ عەلی کوڕی ئەبوو تالیب، بۆیە عەلی لە عوثمان شیاوترە بە دەسەڵات، وەك ئەوەی ئەو هەموو هاوەڵەی دەوری پێغەمبەر ﷺ ئاگایان لە شتی وانەبوو‌بێت و ئێستا کابرایەکی جوولەکەی تازە موسڵمان بوو کە ساتێکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبووە ئەم مەسەلە گرنگەی زانیبێت، ئیتر تەنها ئەم لەسەر حەق و هەموو هاوەڵان یان نەزان یان فێڵباز بوون. ئیبن سەبەئی جوولەکە کەوتە تانەدان لە عوثمان و خۆی بە دڵسۆزی ئیسلام نیشان دا، خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی هەڵخەڵەتان و کەوتنە شوێن راکانی و ئەو هەوڵەی خۆیان بە فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپە دەزانی، رۆژ بە رۆژ ئەو بیرەی سەبەئی بڵاو دەبوویەوە، تا دوای ساڵێك خەڵکەکە داوایان لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کرد بروات لەگەڵ عوثمان قسە بکات، عەلیش چوو و پێی وت: خەڵکێك لە دەرەوە سەبارەت بە تۆ منیان دواندووەو نازانم چی بڵێم، چی هەیە تۆ نەیزانیت و ئەوەی ئێمە دەیزانین تۆیش دەیزانیت، پێش تۆ نەکەوتوین تا شتێکت پێ بڵێین تۆ نەیزانیت، بە

تەنیا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەبوین تا شتیکی تایبەت بزانین و پێت بڵێین، شتێکی تایبەتمان بۆ نەبووە کە لە تۆشاراوە بێت، تۆ هاوەڵ و زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوویت و فەرموودەت لێوە بیستووەو بینیوتە، کوڕی ئەبووقوحافە و کوڕی خەتتابیش لە تۆ لەپێشتر نەبون بە شتێك،تۆ لە خزمایەتیدا نزیکترینیت بە پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی تۆ هەتبوو لە زاوایەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو دوانە نەیانبوو، لە هیچدا پێش تۆ نەکەوتن، دەی بۆ خاتری خوا وریای خۆت بە، کوێرت پێ بینا ناکرێت و نەفامت پێ زانا ناکرێت، ڕێگەکە روونەو پایەکانی دین وەستاون، تۆ دەزانیت ئەی عوثمان چاکترین بەندەی خوا لای خوا پێشەوایەکی دادپەروەرە ڕێنموونی کرابێت و سوننەتێکی روون پەیڕەو بکات و دوور لە بیدعەی روون بگرێت، بەخوا هەردووکیان رونن و سوننەتەکان وەستاو و بەرچاون و بیدعەکانیش هەروا، خراپترین کەس لای خوا پێشەوایەکی ستەمکاری گومڕایە کە خەڵکی بەهۆیەوە گومڕا ببن، ئیتر سوننەتی روون لەناوبەرێت و بیدعەی کەنارخراو زیندوو بکاتەوە، ...

عوثمانیش وەڵامی دایەوەو وتی بەخوا دەمزانی ئەوە دەڵێیت، بەخوا ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە، نە لێت توورە دەبووم و نە تانەم لێدەدایت و نە خراپەیەکم دەکرد، من خزمایەتیم گەیاندووەو درزەکانم گرتووەو پەنای فەوتاوم داوەو لەسەر هەمان شێوەی عومەر کەسەکانم داناوە، ئەی عەلی سوێندت دەدەم بە خوا ئایا دەزانیت موغیرەی کوری شوعبە لێرە نەبوو؟ وتی بەڵێ، وتی دەشزانیت عومەر داینا؟ وتی بەڵێ، عوثمان وتی دەی ئیدی بۆ سەرکۆنەی من دەکەن ئەگەر ئیبن عامیرم لەبەر خزمایەتی دانابێت؟ عەلی پێی وت عومەر کە کەسێکی دادەنا دواتر لاریەکی لێ بەدی بکردایە ئەوپەڕی سزای دەدا، بەڵام تۆ ئەوە ناکەیت، نەرمی و لاوازیت نواندووە بەرامبەر بە خزمانت، عوثمان وتی ئەوانە خزمانی تۆیشن، پاش بڕێك قسەکردن پێکەوە عەلی لای عوثمان چوویە دەرەوەو عوثمانیش بە دوایدا چوویە دەرەوەو چوویە سەر مینبەر و وتارێکی پێشکەش کرد.

لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا میصر شڵەژانێکی بەخۆوە دی، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکری صدیق و موحەممەدی کوڕی ئەبووحوذەیفەو ژمارەیەکی تر لە نەیارانی عوثمان نزیکەی شەش سەد سواریان لە میصرەوە ئامادە کرد و بەڕێکەوتن بەرەو مەدینە و بوون بە چوار بەشەوە بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی و عەبدوڕەحمانی بەلوی و کینانەی کوڕی بیشر و سوودانی کوڕی حمران، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکریش لەگەڵیاندا هات، بەڵام موحەممەدی کوڕی ئەبووحوذەیفە لە میصر مایەوە تا خەڵکی تر هان بدات و بەرگری لەوانە بکات کە ڕۆیشتوون، والی میصریش نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەو ئاگاداری کردەوە لەو ڕووداوە و وتی وەك عومرەکار دێن و وا خۆیان نیشان دەدەن، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، خەلیفە فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب تا پێشهاتنیان بۆ مەدینە بیانگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیان، عەلیش داوای لە عەمماری کوڕی یاسر کرد هاودەمی بکات، بەڵام عەممار رازی نەبوو، چونکە ئەویش تووڕە بوو لە عوثمان لەبەرئەوەی

پێشتر عوثمانی کوڕی عەففان سزای دابوو، ئەوەبوو عەلی خۆی چوو بۆ لایان و لە ناوچەی جوحفە بوون، ئەوانە بە چاوی گەورەییەوە تەماشای علی کوڕی ئەبووطالیبیان دەکرد، عەلی لێیان تووڕە بوو و تەنانەت کەوتە قسە پێ وتنیان، ئەوانیش کەوتنە سەرکۆنەی خۆیان و وتیان لەسەر ئەمە جەنگی خەلیفە دەکەن؟

عەلی وتی بۆچی نەیاری عوثمانن؟ ئەوانیش چەند رەخنەیەکیان ژمارد کە دواتر بە درێژتر باسیان دەکەین، عەلیش یەك یەك وەڵامی رەخنەکانی ئەوانی دایەوە، دەستەیەکیشیان چوون گوێیان لە وتەکانی عوثمان گرت، کە هیچ رەخنەیەکیان نەما، دەستەیەك لە خەڵکی مەدینە داوایان لە عوثمان کرد سزای ئەوانە بدات، عوثمان لێبوردەیی نیشان دا، ئەوانیش گەڕانەوە و عەلیش گەڕایەوە بۆ لای عوثمان و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد و داوایشی لێکرد وتارێك پێشکەش بکات و پۆزش بهێنێتەوە بۆ ئەوەی خزمانی خۆی پێشخستووەو تەوبە نیشان بدات، عوثمانیش راکەی وەرگرت و لە وتاری هەینیدا ئەوەی کرد و نزایەکی تەوبەی کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و هەموو

موسڵمانان گریان، ئینجا مەڕوانی کوڕی حەکەم وتەیەکی زبری پێشکەش کرد و دڵی عەلی رەنجاند، دواتر عوثمان بە راوێژی ژنەکەی ناردی بە شوێن عەلیدا تا بێت بۆ لای و ویستی دڵی بداتەوە، بەڵام عەلی رازی نەبوو، کە خەڵکی میصر بەم رووداوەیان زانی لەگەڵ خەڵکی کووفەو بەصرە کەوتنە نامە گۆڕینەوەو رێککەوتن لەسەر ئەوەی جەنگی عوثمان بکەن، لەو نێوەندەدا بڕێك نامە بەدەم هاوەڵانەوە ساختە کران، ئەوەبوو هەمدی شەش سەد سوار لە میصرەوە بە چوار بەش هاتن وئیبن سەبەئیشیان لەگەڵ بوو، لەو لاشەوە خەڵکی کووفە بە چوار بەش هاتن، خەڵکی بەصرەش بە چوار بەش هاتن، هەریەکەو نیازێکیان هەبوو، میصریەکان دەیانوت دەبێت عەلی ببێت بە خەلیفە، کووفیەکان دەیانوت با زوبەیر ببێت بە خەلیفە، بەصریەکان دەیانوت با طەلحە ببێت بە خەلیفە، هەموو لە مانگی شەووالدا لە دەوری مەدینە خڕ بوونەوە، میصریەکان چوون بۆ لای عەلی، ئەویش حەسەنی کوڕی ناردبوو بۆ لای عوثمان و خۆیشی کەناری گرتبوو، کە هاتن بۆ لای عەلی تووڕە بوو لێیان و دەری کردن،

زوبەیر و طەلحەش بە هەمان شێوەی عەلی بانگەشەکەرانی خۆیانیان دەرکرد ونەفرەتیان لێکردن، ئینجا هەموویان نیازی خۆیان راگەیاند و وتیان داوای ئێمە ئەوەیە عوثمان واز لە خیلافەت بهێنێت، جا میصریەکان دەیانوت جاری پێشوو کە چووینەتەوە نێردراوی عوثمانمان بەدیل گرتووە کە نامەی پێ بووەو نامەکە مۆری عوثمانی لەسەر بووەو تیایدا فەرمانی کردووە هەمووومان بکوژنو دەست و پێیان ببڕن، ئەو نامەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کە عوثمان ئەوەی بیست سوێندی خوارد شتی وای نەوتووەو نەنووسیوە، ئەمەش نامەیەکی ساختە بوو ئامادە کرابوو، هەروەك نامە بە دەم عەلی و زوبەیر و تەلحەوە نووسرابوو کە بێن بۆ لەناوبردنی عوثمان، بارەکە بەو جۆرە بوو تا رۆژی هەینی هات و عوثمان وەك جاران وتاری خۆی پێشکەش کرد، هێندێ دوای ئەوە گەمارۆ درا.

لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی سی و پێنجدا هاتنە ناو مەدینە، عوثمان چاوی کەوت پێیان، ئەوانیش وتیان قورئانێك داوا بکە، ئەویش داوای کرد قورئانێك بهێنن، -کە قورئانەکەی بۆ هێنرا-پێیان وت –سورەتی-

نۆیەم بکەرەوە، واتە سورەتی (یونس)، ئینجا وتیان بیخوێنەرەوە تا گەیشتە ئەم ئایەتە (أذن لكم أم على الله تفترون)، ئینجا پێیان وت بوەستە، ئەزانیت چیت کردووە بە پەچەی ئاژەڵآن؟!

ئایا خوا مۆڵەتی ئەوەی پێداویت یان بەدەم خواوە هەڵت بەستووە؟

عوثمان وتی تێیپەڕێنە، ئەو ئایەتە لەسەر فلآنە مەسەلە دابەزیوە، عومەریش ئەوەی منی کرد و لە وشترەکانی زیادکرد و منیش وام کردووە. ئاوا بەردەوام رەخنەیان لێدەگرت و ئەویش وەڵامی دەدانەوە تا دواتر عوثمان بەوانی وت چیتان دەوێت؟ ئەوانیش بەڵێننامەکەیان هێنا و شەش یان پێنج مەرجیان بۆ نووسی کە هەرکەس دوورخراوەتەوە بگەڕێنرێتەوەو ئەوەی –مووچەی لێ بڕاوە- بۆی بگێردرێتەوە و فەیئیش هەبێت و لە دابەشکردندا دادپەروەر بێت و کەسانی بەهێز و جێمتمانە بکاتە بەرپرس، ئەوەیان لە نامەیەکدا نووسی، ئەویش بەڵێنی لەوان وەرگرت یەکڕیزی تێکنەدەن، ئینجا بە رەزامەندی گەڕانەوە. دەوترێت بەڵکو عەلی ناردووە بۆ لایان و لەسەر ئەو پێنج شتە باسکراوە رێککەوتن و بە رەزامەندی گەڕانەوە، لەو

بارەدا بوون کە سوارێك هات و ڕێی گرت پێیان و چەند جارێك بڵاوەی بە کۆبوونەوەیان دەکرد و دەهاتەوە بەنێویاندا، وتیان ئەوە تۆ چیتە؟- بۆ وادەکەیت؟

ئەویش وتی من نێردراوی ئەمیری باوەڕدارانم بۆ لای کاربەدەستی خۆی لە میصر، ئەوانیش پشکنیان، سەیریان کرد نامەیەکی پێیە کە لەسەر زمانی عوثمان نووسراوەو مۆری ئەوی لێدراوەو ناردوویەتی بۆ کاربەدەستی میصر و فەرمانی پێکردووە-ئەو کۆمەڵە کە گەڕانەوە- لە خاچیان بدات و دەست و پێیان ببڕێت. ئەوانیش گەڕانەوە بەرەو مەدینەو چوون بۆ لای عەلی و پێیان وت تەماشا کە دوژمنی خوا چی کردووە؟!! چی لە بارەمانەوە نووسیوە خوا خوێنی ئەوی حەڵاڵ کردووە، ئینجا بە عەلییان وت لەگەڵ ئێمە وەرە بچین بۆ لای –عوثمان-، ئەویش وتی بەخوا نایەم لەگەڵتان، وتیان ئەی بۆچی –پێشتر- بەڵێننامەت بۆ نووسین؟

ئەویش وتی بەخوا من بۆم نەنووسیون، ئەوانیش لەنێو خۆیاندا سەیری یەکتریان دەکرد، ئینجا عەلی لە مەدینە چوویە دەرەوە.

ئەوانیش چوون بۆ لای عوثمان و پێیان وت: تۆ شتی وات لە بارەی ئێمەوە نووسیوە، ئەویش وتی یان دەبێت دوو موسڵمان بهێنن-کە شایەتیم لەدژ بدەن- یان من سوێند دەخۆم-شتی وام نەنووسیوە-، بەڵام ئەوان بەوە رازی نەبوون و بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوەو گەمارۆیان دا. دەوترێت ئەشتەر هێنراوە بۆ لای عوثمان، ئەشتەریش بە عوثمانی وت ئەو خەڵکە دەیانەوێت یان واز لە دەسەڵات بهێنیت، یان قیصاصیان بدەیتەوە، یان بتکوژن، ئەویش وتی: سەبارەت بە وازهێنانم ئەوا من ئوممەتی موحەممەد بە پەرتی و ناکۆکی جێناهێڵم، سەبارەت بە قیصاصیش ئەوا دوو هاوەڵەکەی پێش من قیصاصیان لەخۆیان وەرنەگرتووەو جەستەی منیش بەرگەی ئەوە ناگرێت.

## ئەو ڕەخنانەی لە عوثمانی کوڕی عەففان دەگیران:

ئیبنولعەرەبی کۆی ئەو ڕەخنانەی کۆکردەوەتەوە کە لە خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان دەگیران و وەڵامی هەریەك لەوانەشی خستوەتەڕوو، ئێمەش هاودەم بە زیادەیەك بۆ وتەکانی ئیبنولعەرەبی هەم ڕەخنەو هەم وەڵامەکان دەخەینەڕوو: هێندەی دا لە عەمار تا ناوسکی تەقی. هێندەی دا لە ئیبن مەسعوود تا ئێسك و پروسکی شکاند و مووچەشی لێ بڕی: ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بە لێدانی ئیبن مەسعوود و مووچەپێنەدانی ئەوە ساختەیە، سەبارەت بە لێدانی عەمماریش هەروەك ئەوی پێشوو درۆ و ساختەیە، ئەگەر ناوسکی بتەقیایە هەرگیز نەدەژیا. زانایان لەو بارەیەوە بڕێ پۆزشیان هێناوەتەوە کە هی ئەوە نیە باسیان بکەین چونکە خودی باسەکە لەسەر پووچی و ناردوستی وەستاوە، ئیتر هیچ حەقێك لەسەر پووچی بنیادنانرێت، بەشوێن پێی نەفاماندا ڕێ نابڕین، چونکە ئەو ڕێی ئەوان کۆتایی نیە.

ئیبن مەسعوود لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا کە بەرپرسی بەیتولمالی موسڵمانان بوو لە کووفە، لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کێشەیەکی بۆ دروست بوو، عوثمانی کوڕی عەففان پاش ماوەیەکی زۆر سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لە والیەتی کووفە لابرد، ئەویش لەبەر کێشەیەك کە لەگەڵ ئیبن مەسعوود هەیبوو، چونکە قەرزی لە بەیتولمال کردبوو کە ئیبن مەسعوود بەرپرسی بوو، کاتێك ئیبن مەسعوود داوای قەرزەکەی کردەوە لە سەعد، سەعد توانای نەبوو بیداتەوە، بۆیە کێشە کەوتە نێوانیانەوە، هەواڵەکە گەیشتەوە بە عوثمان و سەعدی لابرد و وەلیدی کوڕی عوقبەی لە شوێنیدا دانا.

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان نوسخەکانی قورئانی یەکخست و تەنها یەك جۆری هێشتەوە، ئیبن مەسعوود ئامادە نەبوو نوسخەکەی خۆی لاببات چونکە دەیوت من خۆم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەو قورئانەم بیستووە.

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان داوای کرد لە ئیبن مەسعوود بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، خەڵکی کووفە وتیان لێرە بمێنەرەوە ئێمە ناهێڵین هیچ ئازارێکت پێ بگات، ئەویش وتی من گوێڕایەڵی خەلیفەم لەسەرە، دەبینم فیتنە بەڕێوەیە، نامەوێت من یەکەم کەس بم ئەو دەرگایە بکاتەوە، بۆیە خەڵکەکەی گێڕایەوەو بەرەو مەدینە کەوتەڕێ.
پاش ماوەیەك ئیبن مەسعوود نەخۆش کەوت، عوثمانی کوڕی عەففان هات بۆ لای، وتی ئازاری چیت هەیە؟ ئەویش وتی ئازاری تاوانەکانم، وتی ئەی حەز بە چی دەکەیت؟ وتی رەحمەتی پەروەردگارم، وتی ئەی فەرمان نەکەم پزیشکێك بێت بۆ لات، ئەویش وتی پزیشك دەوای کردووم، عوثمان وتی فەرمان نەکەم بەخششت بکەن؟ وتی هیچ پێویستم پێی نیە.

دواجار ئیبن مەسعوود لە مەدینەو لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد، کاتێك وەفاتی کرد نوێژی لەسەر کرا، رایەك دەڵێت عوثمانی کوڕی عەففان نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت عەمماری کوڕی یاسر نوێژی لەسەر کرد، رایەکیش دەڵێت زوبەیری کوڕی

عەووام نوێژی لەسەر کرد، دواتر وەستان تا شەو، چونکە خۆی وەسیەتی کردبوو شەو ئەسپەردەی بکەن، ئینجا لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەیان کرد.

لە کۆکردنەوەی قورئاندا لایداوە و بیدعەی نواندووە لە سووتاندنی موصحەفەکانی قورئاندا: ئیبنلوعەرەبی لەم بارەیەوە دەڵێت: (سەبارەت بە کۆکردنەوەی قورئان، ئەوە کارێکی زۆر چاکی عوثمان بوو کە ئەنجامیدا، هەرچەندە هەموو قورئان لەبەردەست بوو بەڵام خەڵکی راجیابوون-لە خوێندنەوەی- بۆیە چی راجیایی لەسەربوو نەیهێشت و مەسەلەکەی یەکلاکردەوە، بەوەش بەڵێنی خوا هاتەدی بە پاراستنی قورئان کە ئەمەش لەسەردەستی عوثمان هاتەدی وەك چۆن لە نووسینەکانی تایبەت بە قورئان و چەند نوسینی تردا ئەوەمان روونکردوەتەوە. هەموو پێشەوایان ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە زەیدی کوڕی ثابت وتی لەکاتی جەنگی خەڵکی یەمامەدا ئەبووبەکر ناردی بە شوێنمدا، بینیم عومەری کوڕی خەططاب لەلای بوو، ئەبووبەکر وتی عومەر هاتووە بۆ لامان و دەڵێت کوژراوەکانی رۆژی

یەمامە خەریکە ئەوانە نەهێڵێت کە قورئانیان لەبەرە، من دەترسم ئەم بارە وا بڕوات و بەشێکی قورئان لەدەست بچێت، بۆیە پێم باشە قورئان کۆبکرێتەوە، منیش وتم بە عومەر: چۆن شتێك بکەین کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردووە؟

عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەم کارە باشترە، بۆیە بەردەوام لێی دووبارە دەکردمەوە تا خوای گەورە دەروونی والآ کردم بۆ ئەو کارە و رام چوویە سەر راکەی عومەر. ئیتر دەستنووسەکە لای ئەبووبەکر بوو تا وەفاتی کرد، دواتر لای عومەر بوو تا وەفاتی کرد، دواتر لای حەفصەی کچی عومەر بوو تا حوزەیفەی کوڕی یەمان هات بۆ لای عوثمان، ئەوەش کاتێك لە غەزای شام لە فەتحی ئەرمینیا و ئازەربایجان لەگەڵ خەڵکی عێراق بوو کە گەڕایەوە بۆ لای عوثمان باسی جیاوازی خوێندنەوەی قورئانی لای ئەو خەڵکە بۆ عوثمان گێڕایەوە، بۆیە حوذەیفە بە عوثمانی وت ئەی ئەمیری باوەڕداران فریای ئەم ئوممەتە بکەوە پێش ئەوەی وەك ناکۆکی جوولەکەو مەسیحیەکان موسڵمانانیش سەبارەت بە قورئان ناکۆکییان

تێبکەوێت، بۆیە عوثمان کەسی نارد بۆ لای حەفصەو پێی وت نوسخەی موصحەفەکەمان بۆ بنێرە تا لەبەری بنووسینەوە و دواتر دەیگێڕینەوە بۆت، حەفصەش موصحەفەکەی نارد بۆ عوثمان، ئینجا عوثمان فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی ثابت و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدورەحمانی کوڕی حارثی کوڕی هیشام تا لەبەری ئەو موصحەفە چەند نوسخەیەك بگرنەوە، ئەوانیش ئەو کارەیان بەئەنجام گەیاند. عوثمان بە سێ کەسە قورەیشیەکانی وت: ئەگەر ئێوە لە شتێکدا راجیابوون لەگەڵ زەیدی کوڕی ثابت ئەوا بە زمانی قورەیشی بینووسن چونکە قورئان بە زمانی قورەیشی دابەزیوە، ئەوانیش وایان کرد. کاتێك ئیشەکەیان تەواو کرد عوثمان موصحەفەکەی گێڕایەوە بۆ حەفصە، عوثمان بۆ هەر ناوچەیەك موصحەفێکی لەو موصحەفانە نارد کە –دەستەکە- نووسیبوویانەوە و فەرمانی کرد-لە ناوچەکاندا-چی نووسینەوەی تری بەشێکی قورئان و چی موصحەفی تر هەیە بسووتێنرێت.

سەبارەت بەوەی دەوترێت عوثمان موصحەفەکانی تری سووتاندووە یان دڕاندووە، ئەوا هەردووکیان جائیزە ئەگەر مانەوەی ئەو موصحەفانە خراپەی لێ بکەوێتەوە یان شتێکی تێدا بێت کە –لە بنەرەتدا- لە قورئاندا نەبێت یان لەسەر بنەمای قورئان خۆی نەبێت، لەوەشدا هەموو هاوەڵان بێدەنگ بوون و کێشەیان نەبوو، بەڵام گێردراوەتەوە لە ئیبن مەسعوودەوە کە لە کووفە وتاری داوەو وتوویەتی پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: (ومن يغلل يأت بما غل يوم القيامه) جا من بۆ موصحەفەکەی خۆم وادەکەم، هەرکەسیش لە ئێوە ئەوەی پێ دەکرێت با وابکات، بۆیە ئیبن مەسعوود دەیویست موصحەفەکەی خۆی بهێڵێتەوەو ئەوەی تیایدا دەیزانی بهێڵێتەوە، کاتێك ئەوەی بۆ نەکرا ئەوەی وت کە وتی، بۆیە عوثمان ناچاری کرد موصحەفەکەی لابەرێت و رسومەکانی سڕیەوە، بۆیە قیرائەکەی چەسپاو نەمایەوەو خوای گەورە بەو سڕینەوەیە عوثمان و حەقی سەرخست).

ئەبووذەری دوورخستەوە بۆ ناوچەی ڕەبذە. یەکێك لەو مەسەلانەی کە کراوە بە ڕەخنە لەسەر عوثمانی کوڕی عەففان و تانەدان لە خیلافەتەکەی، مەسەلەی چوونی ئەبووذەر بوو بۆ ناوچەی ڕەبذە، چونکە ئەو تۆمەتەی ئاڕاستە کراوە کە ئەو بە زۆر و بە فەرمان ئەبووذەری دوورخستوەتەوە بۆ ناوچەی ڕەبذە، سەبارەت بەم مەسەلەش وردەکاریەکی پێویست دەخەینە ڕوو: ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا (العواصم من القواصم) سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت: سەبارەت بەوەی گوایە ئەبووذەری دوورخستبێتەوە بۆ ناوچەی ڕەبذە ئەوە ڕاست نیەو وای نەکردووە، ئەبووذەر کابرایەکی دنیانەویست و زاهید بوو و سەرکۆنەی کاربەدەستەکانی عوثمانی دەکرد و ئەم ئایەتەی بەسەریاندا دەخوێندەوە (والذين يكنزون الذهب و الفضة و لا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم).

ئەبووذەر پێی وابوو ئەوان لە سوار و جلوبەرگدا زێدەڕۆیی دەکەن، بۆیە لەسەر ئەوە نارەزایی بەرامبەریان دەردەبڕی و سەرکۆنەی دەکردن، دەیویست چی لەو ماڵ و سامانەی بەردەستیان

هەیە دابەش بکرێت، ئەوەش شتێکی پێویست نەبوو. ئیبن عومەر و هاوەڵانێکی تریش دەیانوت هەرچیەك زەکاتەکەی بدەیت ئیتر بریتی نیە لە کۆکردنەوەی –زێڕ و زیو-، ئەوەبوو لە شام دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبووذەر و موعاویەدا روویدا، ئیتر ئەبووذەر هات بۆ مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش هەمان رێی خۆی دەگرتەبەر- دنیانەویستی و ویستی ئەوەی هەموان بەوجۆرە بن-، عوثمان پێی وت خۆزگە کەنارت بگرتایە، مەبەستی ئەوەبوو تۆ لەسەر رێبازێکیت کە بۆ تێکەڵی خەڵك نابێت، چونکە تێکەڵی مەرجی خۆی هەیە و کەنارگرتنیش مەرجی خۆی هەیە، هەرکەسیش بیەوێت وەك ئەبووذەر بژی دەبێت بە تەنها بژی، یان تێکەڵی خەڵك بکات بەڵام وازبهێنێت خەڵکی لەو بارەدا بژین کە لە شەریعەتدا حەرام نەکراوە، ئەوەبوو بۆ پشتگوێخستنی دنیا، ئەبووذەر بە سەربەرزی چوو بەرەو ناوچەی رەبذە، حاڵی ئەبووذەر باشتر بوو، بەڵام ئەو حاڵە بۆ هەموو خەڵك نابێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەو رێبازە بچوونایە بەدڵنیاییەوە لەناودەچوون، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە هەموو حاڵەکانی

ڕێکخستووە. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو ڕەخنە لە عوثمان دەگیرێت لەسەر کارێك کە عومەر -پێشتر- کردبووی، دەگێردرێتەوە کە عومەری کوڕی خەططاب ماوەی یەك ساڵ ئیبن مەسعوودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئەوکات عوثمان ئازادی کردن، عومەر لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە.

دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبووذەرو موعاویەدا ڕوویدا، ئاخۆ ئەبووذەر برێ قسەی دەکرد کە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا ئەوانەی نەدەوت، بۆیە موعاویە ئەم مەسەلەی باس کرد بۆ عوثمان و ترسا ئاشووبێك لەنێو خەڵکیدا دروست بێت، چونکە ئەبووذەر هانیان دەدات بۆ دنیانەویستی و برێ حاڵ کە هەموو خەڵکی بەرگەی ناگرن، بەڵکو بە تایبەت بۆ هەندێ کەس دەبێت و کەمینەیەك دەتوانن بەرگەی بگرن، بۆیە وەك پێشتر باسمان کرد عوثمان نامەی بۆ نووسی تا ئەبووذەر بێت بۆ مەدینە، کاتێك هاتە مەدینە خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەبووذەر بە عوثمانی وت بەنیازم بچم بۆ ناوچەی ڕەبذە،

عوثمانیش وتی وابکە، ئەبووذەریش وایکرد، تەنها ئەو هەنگاوەش بۆ ئەو گونجاو بوو.

ئیبن تەیمیەش پێی وایە چوونی ئەبووذەر بۆ ڕەبذە لەبەر نەگونجانی ئەو ئیجتیهادەی بوو کە کردبووی، لەو بارەوە دەڵێت: ئەبووذەر لە ڕەبذە نیشتەجێ بوو و لەوێش مرد، ئەمەش لەبەر هۆکارێك کە کێشە کەوتە نێوان ئەو و خەڵکەوە، چونکە ئەبووذەر کەسێکی صالحی دنیانەویست بوو، پەیامیشی وابوو کە دونیا نەویستی واجبە و مرۆڤ چی لێ زیادە پێویستی خۆی هەڵبگرێت ئەوە کەنز و سامانێکە کە لە ڕۆژی دواییدا پێی داخ دەکرێت، هەروەها پشتی دەبەست بە شتێك کە لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر نیە، ئەو پشتی دەبەست بە فەرمایشتی خوا (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله...)، بۆیە چی زیاد لە پێویست بوایە بە کەنزی دادەنا، بۆ ئەوەش پشتی دەبەست بەوەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستبوو کە فەرموویبووی:

(يا أبا ذر ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا يمضي عليه ثالثة وعندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين)، (ئەی ئەبووذەر حەز ناکەم هێندە کێوی ئوحود زێڕم هەبێت و سیانەی بەسەردا تێپەڕ بێت و دیناڕێ لەو زێڕە لای من مابێت مەگەر بۆ قەرزم دانابێت)....

کاتێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف مرد و سامانێکی جێهێشت ئەبووذەر ئەوەی بەو کەنزە دانا کە لەسەری سزا دەدرێت، عوثمانیش سەبارەت بەو مەسەلە دانوستان و مشتومڕی لەگەڵ ئەبووذەر دەکرد تا ئەوەی کەعب هاتەژوورەوەو هاوڕای عوثمان بوو، ئەبووذەر لێیدا، هەر لەسەر ئەوەش ئەبووذەر لە شام کێشەی لەگەڵ موعاویە هەبوو، دەستەیەکیش هەبوون هاوڕای ئەبووذەر بوون...

خۆ خوای گەورە لە قورئاندا میراتی دیاری کردووەو دابەشی کردووە، دەی میراتیش بۆ کەسێك دەبێت کە دوای خۆی سامانێك جێبهێڵێت، چەندین هاوەڵ لە پشتیوانان و بگرە لە کۆچەرانیش هەبون کە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ سامانیان هەبووە، چەندین پێغەمبەریش هەبون کە سامانیان هەبووە، ئەبووذەر دەیویست شتێك لەسەر خەڵك

واجب بکات کە خوا واجبی نەکردبوو لەسەریان، لەسەر شتێك سەرکۆنەیان بکات کە خوا لەسەر ئەوە سەرکۆنەی نەدەکردن، ئەو لەو رایەیدا موجتەهید بوو و وەك هەموو موجتەهیدانی تر لەسەر گوێڕایەڵیەکەی پاداشت وەردەگرێت...

لە سەردەمی خیلافەتی عوثماندا -ماڵ و سامان زۆر بوو- و دەوڵەمەندان خوویان دایە زۆر بواری دنیا کە هەیانبوو لە رووی رێژە و جۆرەوە دەچوونە مەیدانی موباحەوە، ئەبووذەریش هێندە نکووڵی دەکرد لێیان تا ئەوەی رێی موباحیشی لێ دادەخستن، ئەمەش هۆکارێکی کێشەی نێوان دوو تاقمەکە بوو، بۆیە کەنارگرتنی ئەبووذەر لەبەر ئەو هۆکارە بوو، ئەگەرنا عوثمان هیچ کێشە و مەرامێکی بەرامبەر بە ئەبووذەر نەبوو، ئەوەش کە دەڵێت ئەبووذەر ڕاستگۆترین کەسە واتای ئەوە نییە لە هەموویان باشتر بێت، بەڵکو کەسێکی باوەڕداری لاواز بوو، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

( يا أباذر إني أراك ضعيفا، وإنى أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم) (ئەی ئەبووذەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش پێیە، حەزم دەی بەرپرسیارێتی دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)، یان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف و في كل الخير) ئەهلی شورایش باوەڕدارانی بەهێز بوون، ئەبووذەرو هاووێنەکانیشی باوەڕدارانی لاواز بوون، باوەڕدارانی چاکی نێو خیلافەت وەك عوثمان و عەلی و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف باشتر بوون لە ئەبووذەر و هاووێنەکانی.

عەسکەری دەڵێت: ئەبووذەر خۆی لەبەر زوهد و دوورگرتنی لەو سامانەی لە دەستی خەڵکدایە چوون بۆ ڕەبذەی هەڵبژارد ئیبن خەلدوون دەڵێت: ئەبووذەر داوای مۆڵەتی کرد لە عوثمان تا لە مەدینە بچێتە دەرەوە، عوثمانیش مۆڵەتی دا و ئەبووذەریش چوو لە ڕەبذە دابەزی و لەوێ مزگەوتێکی بنیاد نا و عوثمانیش وشتری پێدا و دوو

مەملووکی-خزمەتکاری- بۆ دانا و مووچەشی بۆ بڕیەوە، هەروەها عوثمان پەیامی نارد بۆ ئەبووذەر و پێی وت جارجارە سەردانی مەدینە بکە تا نەریتی دەشتەکی وەرنەگریت، ئەویش وایدەکرد.

بێگومان ئەبووذەری غیفاری لە ئاشووبخوازەکان نەبوو، بەڵکو موجتەهیدێك بوو کە لە بوارێکی ئیجتیهادەکانیدا نەیپێکا، بەڵام ئەوەی کە کێشە بوو ئەوەبوو ئاشووبخوازان ئەو بانگەوازەی ئەبووذەریان قۆستەوە بۆ مەرامی پیسی خۆیان و توانییان بیکەنە چەکێك بۆ دژایەتی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففان و دواجار ڕەواکردنی خوێنی، هیچکام لە هاوەڵان و تابعیەکان و زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعەش گومانیان نیە لەوەی ئەبووذەر هیچ پەیوەندی و هاوکاریەکی نەبووە لەگەڵ ئاشووبخوازان، بەڵکو نیازێکی چاکسازی هەبووەو ئیجتیهادێکی کردووەو ئیجتیهادەکەی نەیپێکاوەو پشت بەخوا یەك پاداشتی دەست کەوتووە. ئەبوودەردائی لە شام دەرکرد: ئیبنولعەرەبی دەڵێت: (هەروەها دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبوودەردائو موعاویەدا ڕوویدا، چونکە ئەبوودەردائیش کەسێکی زاهید و

دونیانەویست بوو و دادوەری خەڵکیش بوو -لە دیمەشق-، کاتێك لە مەسەلەی حەقدا زۆر مەسەلەکەی قووڵ دەکردەوە و ئەو ڕێبازەی عومەری لەناو خەڵکدا پەیڕەو دەکرا ئەویش پەیڕەوی دەکرد، خەڵکی بەرگەی ئەوەیان نەگرت و لایان برد، ئەویش چوو بەرەو مەدینە، ئەوانە هەموو برێ بەرژەوەندین کە زیان بە ئایینداری ناگەیەنن و کار ناکەنە سەر پێگەی هیچ موسڵمانێك، ئەبووذەر و ئەبوودەردائیش دووربوون لە عەیبەو کەموکورتی، عوثمانیش زۆر دوور و بێگەرد بوو، هەر کەسێکیش بڵێت عوثمان بەو هۆکارە دوورخستنەوەی بەکارهێناوە ئەوە هەموو ئەو قسانە پووچ و بێبنەمان).

حەکەمی گێڕایەوە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووری خستبوویەوە: حەکەمی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی ئومەییەی ئومەویە، مامی عوثمانی کوڕی عەففانە، باوکی مەڕوانی کوڕی حەکەمە، دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو و چوو لە مەدینە نیشتەجێ بوو.

پێغەمبەر ﷺ حەکەمی دوورخستەوە بۆ ناوچەی طائیف، ئیتر لەوێ مایەوە، ئینجا کە ئەبووبەکر بوو بە خەلیفە داوا کرا حەکەم بگێڕێتەوە، ئەویش وتی گرێیەك ناکەمەوە کە پێغەمبەر ﷺ گرێی داوە، تا لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا گەڕێنرایەوە بۆ مەدینە.

حەکەم لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەککە ئازاری زۆری پێغەمبەری خوای ﷺ دەدا، تەنانەت ئەو شەوەی کۆبوونەوە تا بچن پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی خۆیدا بکوژن، یەکێك لەوانە حەکەم بوو.

حەکەم تەنانەت بەرامبەر بە موسڵمانانیش خراپەی زۆری نواند، ئەوەبوو کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان موسڵمان بوو، حەکەم کە مامی بوو عوثمانی گرت و بە گوریس بەستیەوەو وتی سوێند بەخوا تا نەگەڕێیتەوە سەر ئایینی باوباپیرانت ناتکەمەوە، عوثمانیش وتی سوێند بەخوا هەرگیز وازی لێ ناهێنم، کاتێك حەکەم بینی عوثمان زۆر سوورە لەسەر ئایینەکەی وازی لێهێنا و بەریدا.

ئیبن حەجەر چەند فەرموودەیەکی هێناوە کە باس لەوە دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ نزای خراپەی کردووە لە حەکەم، بەڵام صەحیح بوونی هیچکام لەو فەرموودانە ناسەلمێنێت. سەبارەت بە هۆکاری دوورخستنەوەکەی دەوترێت نهێنی پێغەمبەری خوای ﷺ ئاشکرا کردووەو باسی کردووە، بۆیە دوورخراوەتەوە.

حەکەم لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا وەفاتی کرد، ئەوەش لە ساڵی سی و یەکی کۆچیدا بوو.

هەرچۆنێك بێت نەفی کردنی حەکەم و نەگێڕانەوەی تا وەفاتی و بەردەوامی هەر دوو خەلیفەی دواتریش لەسەر ئەو بنەمایە، بەڵگەیە لەسەر ئاستی لاساریەك کە حەکەم نواندوویەتی، بەڵام ئەوە نابێتە تۆمەت بۆ خەلیفەی سێیەمی باوەڕداران، چونکە گێڕانەوەیەك هەیە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ پێش مردنی لەسەر داوای عوثمان رازی بووە حەکەم بگەڕێتەوە، بەڵام پێش گەڕانەوەی وەفاتی کردووە و دواتریش هەردوو خەلیفەی دواتر بۆ پەیڕەوی ئەو فەرمانە داوای شاهیدێکیان کردووە لە عوثمان و ئەویش شایەتێکی تری نەبووە.

بۆیە ئەمە چەند خاڵێك دەخەینەڕوو: یەکەم: ئەوەی عوثمان چووەو سکاڵای بۆ کردووە لای پێغەمبەر ﷺ شتێکی هەڵەو تاوان نەبووە، چونکە هێشتنەوەی خزمایەتی و هەوڵی چاکەکردن لەگەڵ خزمان شتێکی ڕێپێدراوە لە ئیسلامدا مادەم نەبێتە زیان بۆ باوەڕداران بە گشتی، ئەوەش کە عوثمان چووە داوای لێخۆشبوونی بۆ موسڵمانێکی هەڵەکار کردووە نەك بۆ بێباوەڕێك، هەروەها تکای بۆ کردووە لای پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەری خوایش ﷺ ڕازی بووە نیشانەی ئەو هەموو ڕێز و خۆشەویستیەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەیبووە بۆ عوثمانی کوڕی عەففان.

دووەم: پابەندی بێشوماری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە گشتی و خەلیفە ڕاشیدینەکان بە تایبەتی و ئەبووبەکر و عومەر بە تایبەتی تر لەم نمونەدا دەردەکەوێت کە چەندە ورد و وریا بون لە هەڵسوکەوت لەگەڵ بنەماکانی شەریعەتدا، کاتێك زانیویانە شەرع داوای شایەت دەکات بۆ هەر سکاڵآ و پرسێك، ئامادە نەبون تەنانەت قسەو سکاڵآی موژدەپێدراوی بەهەشتیش وەربگرن کە عوثمانە، خۆ ئەوان دەیانزانی

کە عوثمان چەندە راستگۆ و دلسۆز بە ئیسلام بووەو ئەگەر هەرچیەك بچووکترین لادانی دژ بە پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا بوو‌بێت هەرگیز قبووڵی نەکردووە، عوثمان موژدەپێدراوی بەهەشت و دوو جار زاوای پێغەمبەر ﷺ بووە، عوثمان هۆکاری بەیعەتی ریزوان بووە، کەچی هەر فەرمانی شەریعەتیان بۆ شایەتیەکی ئەو پشتگوێ نەخستووە، جا ئەگەر بۆ مەسەلەیکی کاتی لاوەکی وا ورد بووبن، دەبێت لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا چ وریایی و دڵنیاییەکیان گرتبێتەبەر.

سێیەم: گەورەیی عوثمان و رێزگرتنی لە فەرمانی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئیسلامی نیشان دەدات، ئەو هەرچەندە خۆی چووبوویە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و رەزامەندی پێغەمبەری خوای ﷺ وەرگرتبوو، بەڵام کاتێك زانی بەڵگەی تەواوی بەدەستەوە نیە بۆ سەلماندنی راستیەکەی، ئامادە بوو ملکەچی فەرمانێك بێت کە لەپێناو هێشتنەوەی راستیەکاندا راستیەکی ئەوی پەك دەخست، ئەمەش تەنها لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەوەشێتەوە هێندە وریا و کارامە بن.

چوارەم: عوثمان هەرگیز ئامادە نەبووە لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەربچێت، خۆ کاتێك ئەبوو سوفیان هاتە مەدینەوەو تکای کرد لە چەند کەسێك و لەوانەش عوثمان تا بیبەن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای بۆ بکەن تا لەسەر ڕێککەوتنی قورەیش و پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ بکات، عوثمان ئامادەیی نەبوو سکاڵای بۆ بکات هەرچەندە لە هەمان هۆز بوون، چونکە دەیزانی ئەمە ڕەوا نیە، بەڵام سکاڵا کردنی بۆ حەکەم لەبەرئەوەی پێ ڕەوابوو چونکە هەم حەکەم شایەتومانی بە زار دەربڕیبوو و خۆی بە موسڵمان ناساندبوو و خواش زاناترە بە موسڵمانێتیەکەی، هەم هاتنەوەی ئەو هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بە زیان گەیاندن بە موسڵمانان چونکە تاکێك بوو و هیچی تر، هەروەها ئەو کە زانی پێغەمبەر ﷺ ڕازی بووە ئینجا چوو داوای لە ئەبووبەکر و عومەریش کرد تا ئەو ڕەزامەندیە جێبەجێ بکەن، کاتێکیش بەڵگەی تەواوی بۆ ئەوە دەست نەکەوت بێدەنگی هەڵبژارد نەك نانەوەی ئاژاوەو ناڕەزایی.

سەبارەت بەوەی بۆچی عوثمانی کوڕی عەففان حەکەمی گێڕایەوە، ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا (العواصم من القواصم) دەڵێت: سەبارەت بە تۆمەتی گێڕانەوەی حەکەم ئەمەش ڕاستی نیە، زانایانمان لە وەڵامی ئەو گومانەدا دەڵێن پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دابوو بە حەکەم تا بچێتەوە مەدینە، عوثمان ئەمەی وت بە ئەبووبەکر و عومەر، ئەوانیش وتیان ئەگەر شاهیدێکت هەیە بۆ ئەوە ئەوا دەیگێڕینەوە، بۆیە کاتێك خۆی بوو بە خەلیفە ئیشی کرد بەو زانیاریەی هەیبوو-کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بە حەکەم بچێتەوە مەدینە-، عوثمان ئامادە نەبوو پەیوەندی لەگەڵ کەسێك هەبێت کە پێغەمبەر ﷺ پەیوەندی لەگەڵ بپچڕاندایە با تەنانەت باوکیشی بوایە، ئەو هەرگیز ئامادە نەبوو حوکمی پێغەمبەر ﷺ هەڵبوەشێنێتەوە.

سوننەتی کورتکردنەوەی نوێژی لە سەفەردا لەکارخست:
ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بە کورتنەکردنەوەی نوێژەکان لە سەفەردا ئیجتیهادێکی عوثمان بوو، چونکە بیستبووی خەڵکی لە مەسەلەی کورتکردنەوەی نوێژەکاندا تێکەوتون و وایان لێهاتووە

تەنانەت لە ماڵەوەش کورتکردنەوەی نوێژەکان دەکەن، بۆیە گومانی ئەوەی برد ئەنجامدانی سوننەتێك ببێتە هۆی لەکارخستنی فەرز، بۆیە لەترسی نەکەوتنە ئەو داوو هەڵەوە کورتکردنەوەی نوێژەکانی لە سەفەردا تەرك کرد، هەرچەندە دەستەیەك لە زانایان دەڵێن کەسی گەشتیار سەربەستە لەوەی ئایا بە کورتکردنەوە نوێژەکانی بکات یان بێ کورتکردنەوە نوێژەکانی بکات، هاوەڵانیش لەو بارەوە راجیا بوون.

موعاویەی-کوڕی ئەبووسوفیانی- کرد بە والی کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نیە: سەبارەت بە موعاویە ئەوا –یەکەم جار- عومەر کردی بە والی و هەموو ناوچەکانی شامی دایەدەست، دواتریش عوثمان لەو پۆستەیدا هێشتیەوە، بەڵکو با بڵێین ئەبووبەکر –یەکەمجار- بەرپرسیارێتی پێدا، چونکە زیادی برای موعاویەی کرد بە والی و زیادیش ئەوی کرد بە جێگرەوەی خۆی، ئەوەبوو عوثمانش هێشتیەوە چونکە پەیوەندی هەبوو بە ویلایەتی ئەبووبەکرەوە، جا عوثمانیش وەك عومەری کرد و هێشتیەوە، دەی بڕواننە ئەو زنجیرەیە چەندە پەیوەست و پتەو بووە، هەرگیز نموونەی وا نابینرێتەوە.

عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیزی کرد بە والی کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نیە: عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیز کردی بە بەرپرس-وەك دەوترێت- چونکە پوورەکانی زۆر رێزدار بوون.

مەڕوانی کرد بە والی کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نیە: ئەو قسەلۆکانەی سەبارەت بە مەڕوان و وەلید هاتون زۆر سەختن و ئەوانەی حوکمی فاسق بوونیان داوە لەسەریان لە فاسقی خۆیانەوە ئەو حوکمەیان بەسەرداداون، مەڕوان پیاوێکی عەدل بووەو لە گەورە پێشەوایانی لای هاوەڵان و تابعیەکان و فیقهناسانی موسڵمانان بووە، سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی کە لە هاوەڵان بووە گێڕانەوەی لێ گێڕاوەتەوە، سەبارەت بە تابیعیەکانیش هاوتەمەنانی خۆی بون... سەبارەت بە فیقهناسانی ناوچەکانیش هەموویان بەگەورەیان داناوەو خیلافەتەکەیان بە رەوا داناوە و فەتوای ئەویان وەرگرتووە و ملکەچی گێڕانەوەی بون، مێژوونووس و ئەدیبەکانیش لە ئاست خۆیاندا قسەیان کردووە.

وەلیدی کوڕی عوقبەی کرد بە والی کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نیە: ئیبنولعەرەبی دەڵێت: (سەبارەت بە دانانی وەلیدی کوڕی عوقبە ئەوا –هاودەم بە خراپی نیازەکان- خەڵکی پێش چاکە خراپەیان گرتەبەر، بۆیە درۆسازان کەوتنە باسی ئەوەی عوثمان بۆ نیازی خۆی کردوویەتی بە بەرپرس، عوثمان دەڵێت من وەلیدم دانەناوە لەبەرئەوەی برام بوو بێت، بەڵکو لەبەرئەوە دامناوە کە کوڕی ئوم حەکیمی بەیضائە، ئەو ژنەش پووری پێغەمبەرﷺ و دوانەش بووە لەگەڵ باوکی پێغەمبەری خوادا ﷺ واتە ئوم حەکیم و عەبدوڵای باوکی پێغەمبەر ﷺ بە یەك سك لەدایك بون-. پشت بەخوا دواتریش روونی دەکەینەوە، دانانی والیش ئیجتیهادە، عومەر سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لابرد و کەسی پلەنزمتر لەوی پێش ئەو خست، بە عوثمان وترا تۆ وەلیدت داناوە چونکە وەلید براتە لە رێی دایکتەوە (ئەروای کچی کورەیزی کوڕی رەبیعەی کوڕی حەبیبی کوڕی عەبدشەمس)، ئەویش وتی بەڵکو بۆیە کردوومە بە والی چونکە پوورزای پێغەمبەری خوایە ﷺ چونکە ئوم حەکیم پووری

پێغەمبەر ﷺ بوو و دایەگەورەی عوثمان و دایەگەورەی وەلید بووە لەرووی دایکیانەوە کە ئەروا بووە، ئوم حەکیم دوانە بووە لەگەڵ عەبدوڵای باوکی پێغەمبەری خوادا ﷺ جا چ کێشەیەك هەیە کەسێك برای خۆی یان کەسی نزیکی خۆی دابنێت.

پێنج یەکی ئەفریقیای دا بە مەڕوان.

سەبارەت بەوەی عوثمان پێنج یەکی ئەفریقیای دابێت بە یەك کەس ئەوە راست نیە، مالیك و دەستەیەکی تر پێیان وایە پێشەوا – ئیمام- رای خۆی دەبێت لەسەر پێنج یەك و دواتر بە پێی ئیجتیهادەکەی جێبەجێی دەکات، دەشتوانێت هەمووی ببەخشێت بە یەك کەس. عومەر بە قامچی لێدانی حەددی لێدەدا، کەچی ئەم کردی بە گۆچان: سەبارەت بەوەی دەڵێن عوثمان بە گۆچان لە خەڵکی دابێت، لە هیچ یاخی و گوێڕایەڵێك ئەوەم نەبیستووە، بەڵکو گێڕانەوەیەکی پووچ و بێبنەمایە و هەواڵێکە بازاڕگەرمی بۆ کراوە، پەنابەخوا لە هەر خراپەیەك.

چوویە سەر پلیكانەكەی پێغەمبەرﷺ لە كاتێكدا ئەبووبەكر و عومەر لەو پلیكانە خوارتر دەوەستان-بۆ وتاردان-: سەبارەت بەوەی دەوترێت عوثمانی كوڕی عەففان چوەتە شوێن مینبەرەكەی پێغەمبەر ﷺ ئەوا ئەمەم لە هیچ كەس نەبیستووە كە توقیەی هەبێت، بەڵكو بانگەشەیەكی ناڕەوایە بۆ باس و گێڕانەوە، ئیتر ئەوەی دڵی پێی دەگۆڕێت دڵی دەگۆڕێت، زانایانمان دەڵێن: ئەگەریش ئەوە راست بێت-وای كردبێت- ئەوە هیچ شتێكی تێدا نیە كە خوێن رشتنی حەڵاڵ بكات، یان لەوانەشە ئەو كارەی حەق بووبێت و هاوەڵانیش لەسەر ئەوە گلەیی و نارەزاییان نەبووبێت، واتە سەرەتا یان لەبەر هۆكاری پێویست ئەوەیان بە رەوا زانیبێت، ئەگەریش نەبووبێت-واتە شتی وای نەكردبێت- ئەوە ئیتر مشتومڕێكی لەسە نامێنێت.

ئامادەی غەزای بەدر نەبووبوو، لە رۆژی ئوحودیش شكستی خوارد، لە بەیعەتی ریزوانیشدا ئامادە نەبوو: جارێك ئیبن عومەر لەگەڵ خەڵكێكی قورەیشیدا دانیشتبوو، كابرایەكی میصری هات بۆ لای، وتی ئەی ئیبن عومەر پرسیارێكت لێدەكەم وەڵامم بدەرەوە، ئایا

دەزانیت عوثمان لە ڕۆژی ئوحوددا رایکرد؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەدردا ئامادە نەبو؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەیعەتی ریضواندا ئامادە نەبوو؟ وتی بەڵێ، کابرا وتی الله اکبر، ئیبن عومەر وتی وەرە با بۆت روون بکەمەوە، راکردنی ئوحودی من شایەتی دەدەم کە خوا لێی خۆش بوو، بۆ ئامادە نەبوونی بەدریش لەبەرئەوە بوو کە کچەکەی پێغەمبەر ﷺ هاوسەری بوو و نەخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو تۆ پاداشت و پشکی یەکێك لە ئامادەبوانی بەدرت هەیە، بۆ ئامادەنەبوونیشی لە بەیعەتی ریضوان، ئەوە ئەگەر لەناو مەککەدا بڵندپایەتر لە عوثمان هەبوایە پێغەمبەر ﷺ ئەوی لەبری عوثمان دەنارد، پێغەمبەر ﷺ عوثمانی نارد و بەیعەتەکە دوای ئەوە بوو کە عوثمان چوو بۆ مەککە، لە کاتی بەیعەتەکەدا پێغەمبەر ﷺ دەستی راستی نیشان دا و فەرمووی ئەوە دەستی عوثمانە، دەستی راستی دا بەسەر دەستەکەی تریدا و فەرمووی (ئەوە بۆ عوثمان)، ئینجا ئیبن عومەر بە کابرای وت دەی ئێستا برۆ.

عوبەیدوڵای کوڕی عومەری لە هورمزان نەکوشت-ئەو کەسەی کە چەقۆکەی دا بە ئەبوولوئلوئەو دژ بە عومەر هانی دا تا عومەری کوشت-: سەبارەت بە ئامادەنەبوونی عوثمان بۆ کوشتنی عوبەیدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەططاب لە هورمزان ئەوە ناراست و پووچە، چونکە ئەگەر ئەو ئەوەی نەکرد خۆ هاوەڵانی تر لەوێ ئامادە بوون، مەسەلەکەش لەسەرەتادا بوو، دەوترێت: هورمزان هەوڵی داوە بۆ کوشتنی عومەر و خەنجەری هەڵگرتووەو لەژێر جلەکانیەوە دەرکەوتووە...

لەوانەشە عوثمان حەقێکی بەسەر عوبەیدوڵاوە بەدی نەکردبێت، چونکە بارو کاری هورمزانی بۆ دەرکەوت، هەروەها کەس داوا ئەوەی نەدەکرد، لەگەڵ هەموو ئەو ئەگەرانەشدا چۆن دروستە بڕوانێتە مەسەلەیەك کە دروست و صەحیح نیە.

لەسەر وشترەکەی لەگەڵ کۆیلەکەیدا نامەیەکی نووسی بۆ ئیبن ئەبی سەرح سەبارەت بە کوشتنی ئەو کەسانەی لە نامەکەدا باسی کردبوون: ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بەوەی دەڵێن نامەکە لەگەڵ

سوارێکدا گیراوە-یان لەگەڵ کۆیلەکەی گیراوە- هیچ کەسیش ناڵێت کۆیلەکەی بووە، گوایە نامەی بردووە بۆ عەبدوڵای کوڕی ئەبووسەرح و تیایدا فەرمانی پێکردووە هەڵگرانی نامەکە بکوژێت، -بەڵام لە راستیدا- عوثمان بە خەڵکەکەی وت یان دەبنە شایەتی ئەو شتە- کە من وام وتبێت-، یان سوێند دەخۆم من ئەوەم نەنووسیوە و فەرمانم بە شتی وا نەکردووە، جار هەیە بە ناوی کەسێکەوە قسە دەنووسرێت و ساختەی دەستنووسی دەکرێت و مۆرەکەشی ساختەی لەسەر دەکرێت، بەڵام ئەوان وتیان دەبێت تۆ مەروان بدەیتە دەست ئێمە، ئەویش وتی شتی وا ناکەم، چونکە ئەگەر مەڕوانی بدایە بەدەستەوە ئەوە ستەمکار دەبوو، ئەو خەڵکە دەبوو لای عوثمان داوای حەقی خۆیان لە مەڕوان و هەر کەسێکی تریش بکەن، ئەگەر بچەسپایە عوثمان شتی وای کردووە ئینجا حەق بۆ خاوەن حەق دەبێت، بەڵام پێشینەو گەورەیی و پلەوپایەی ئەو هی ئەوە نەبوو لە دەسەڵاتەکەی لاببرێت چ جای کوشتنی.

گەمارۆدانی ماڵی عوثمان پاش کۆتا وتاری عوثمان لە هەینیدا، تووشی ژانەسەرێك بوو و لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردیانەوە بۆ ماڵەوە، نەیارەکانی کە لەو شوێنە جیاوازانەوە هاتبوون، هاتن و گەماری ماڵەکەیان دا، بەرامبەر بەوە خێرا دەستەیەك لە منداڵانی هاوەڵان بە فەرمانی باوکیان چوون بۆ ماڵی عوثمان تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، لەوانە حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و عەبدوڵای کوڕی عەمر.

صەفییەی دایکی باوەڕداران بە ولاخێکەوە چوو تا بچێت بۆ لای عوثمان، کەچی ئەشتەر هاتە ڕێی و نەیهێشت، صەفییە وتی بمگێڕنەوە با ئەمە ئابڕووم نەبات، دواتر حەسەنی لە نێوان ماڵی خۆی و عوثماندا داناو خواردن و خواردنەوەی دەنارد بۆ عوثمان.

لەو کاتەی عوثمانی کوڕی عەففان گەمارۆ درا، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر هاودەم بە ئیبن عومەر و حەسەن و حوسەین و مەڕوان و ئەبووهورەیرە و ژمارەیەکی تر وەستان تا بەرگری بکەن لە خەلیفە، خەلیفەش سوێندی دان کە وازبهێنن و بچنەوە ماڵەوە، بەڵام عەبدوڵا

و حەسەنی کوڕی عەلی و مەڕوانی کوڕی حەکەم نەچوونەوەو بەرگرییان کرد، عەبدوڵا چەندین شمشێر و تیری بەرکەوت و زۆر بریندار بوو، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلی و مەروِانیش بریندار بوون.

زەیدی کوڕی ثابت هات و وتی وا پشتیوانان لەبەردەرگان و دەڵێن ئەگەر دەتەوێت ئێمە دووبارە پشتیوانانی خواین، عوثمان وتی پێویستم بەوە نیە، دەست بگرنەوە-و مەجەنگن-. ئەبووهورەیرە پێی وت ئەمڕۆ هاودەم بە تۆ دەمێنمەوە، عوثمان پێی وت تکام لێت هەیە- بڕیارم بۆت ئەوەیە- بچیتەدەرەوە-جێمبهێڵیت-، حەسەنی کوڕی عەلی کۆتا کەس بوو کە لەلای مابوویەوە، چونکە حەسەن و حوسەین و ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر و مەڕوان هاتبوون بۆ لای، ئەویش زۆر جەختی لێکردنەوە چەکەکانیان دابنێن و بچنەدەرەوەو بچنەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئیبن زوبەیر و مەڕوان پێیان وت: ئێمە بڕیارمان لەسەر خۆمان داوەو وازناهێنین، عوثمانیش دەرگاکەی کردەوەو –لە راستترین گێڕانەوەدا هاتووە-چوونە ژوورەوە بۆ لای.

ئاشووبگێڕان تەنانەت نەیاندەهێشت عوثمان ئاویش بخواتەوە، ئەو ئاوەی کە خۆی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بیرەکەی کڕیبوو بۆ موسڵمانان، عوثمان وتی ئادەی ئەو دوانەم بۆ بانگ بکەن کە هانتان دەدەن لە دژی من، ئەوانیش هاتن، عوثمان وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن کە پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە ئاوێکی سازگاری تێدا نەبوو جگە لە بیری روومە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (من يشتري بئر رومة فيجعل دلوه مع دلاء المسلمين بخير له منها في الجنة)، (هەرکەس بیری روومە بکرێت سەتڵی لەگەڵ سەتڵی موسڵماناندا بە چاکتر لە بەهەشت وەربگرێتەوە)،

منیش لە سامانی خۆم کڕیم کەچی ئێستا تەنانەت ناهێڵن لە ئاوی دەریاش بخۆمەوە، وتیان بەڕێ وەڵآ وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن مزگەوت تەنگەبەر بووبوو بۆ موسڵمانان و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (من يشتري بقعة آل فلان فيزيدها في المسجد بخير له منها في الجنة)، (کێ پارچە زەوی فلآنە کەس دەکڕێت تا مزگەوتەکەی پێ فراوان بکات و لە بەهەشتدا لەوە چاکتری بۆ هەبێت)،

منیش لە سامانی خۆم کڕیم کەچی ئەمڕۆ ناهێڵن دوو رکات نوێژی تێدا بکەم؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن من لە سامانی خۆم سوپای عوسرە-تەبووك-م پڕچەك کرد؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، وتی سوێندتان دەدەم بە خوا دەزانن پێغەمبەر ﷺ لە شاخی ثەبیرەوە دەیڕوانی بەسەر مەککەداو ئەبووبەکر و عومەرو منی لەگەڵ بوو، کە شاخەکە جووڵاَ تا بەردی لێ کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺبە قاچی لێیدا و فەرمووی (دامرکێ ئەی ثەبیر پێغەمبەرێك و صدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە)؟ وتیان بەڵێ بەخوا وایە، ئەویش وتی الله اکبر سوێند بە خوای کەعبە شایەتیان بۆ دام کە من شەهیدم، سێ جار ئەوەی وت.

شەهیدبوونی: لە کۆتا رۆژی ژیانیدا عوثمانی کوڕی عەففان بەڕۆژوو بوو، دەیوت خەوم دیوە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی ئەگەر دەست نەکەیتەوە بەرامبەر بەو هێرشبەرانە دەتکوژن و لای ئێمە رۆژوو دەکەیتەوە.

عوثمان ئەشتەری بانگ کرد و وتی ئەو خەڵکە چییان دەوێت؟ ئەویش وتی سێ شت، یان کارەکە بدەیتە دەست ئەوان چییان دەوێت بیکەن، یان خۆت بدەیت بە دەستەوە یان بتکوژن، عوثمان وتی بۆ وازهێنان جلێك داناکەنم کە خوا کردوویەتیە بەرم، بۆ خۆبەدەستەوەدانیش ئەگەر بمکوژن بەخوا دوای من یەکرێزی نابیننەوە، لەو سەروبەندەدا کەسێك هات و دەرگاکەی کردەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر هاودەم بە سیانزە کەس هاتە ژوورەوە، موحەممەد ریشی عوثمانی گرت و توند رایکێشا و سەری بەرز کردەوە و دەیوت موعاویەو ئیبن عامیر و نامەکانت فریات ناکەون، ئەویش وتی برازا ریشم بەردە، موحەممەدیش ئاماژەی بۆ کەسێك کرد، کەسەکە هات و دای لە سەری، ئینجا کەوتنە کوشتنی، بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە موحەممەد ریشی عوثمانی گرت، عوثمان وتی برازا ریشم بەردە، شوێنێکت گرتووم کە باوکت دەستی لێنەداوە، موحەممەدیش شەرم گرتی و کەناری گرت، خەڵکەکە هاتنە ژوورەوەو موحەممەد ویستی بەریان پێ بگرێت بەڵام نەیتوانی، ئیتر

موحەممەد ماڵەکەی جێهێشت، کەسێك هات و بە دارێك دای لە سەری عوثمان و خوێن لە سەری دەچۆڕا، ئینجا کەوتنە لێدانی بە شمشێر، نائیلەی ژنی خۆی خستە بەردەمی و دەیقیژاند، کەچی دەستی ئەویش بەرکەوت و پەنجەکانی بڕان، چی شمەك لە ماڵەکەدا هەبوو هەموویان برد، سەری عوثمانیش لەولاوە کەوتبوویە لای قورئانەکەوە، کەسێك بە قاچی ددای لە سەری و لە قورئانەکە دووری خستەوە.

ماوەی گەمارۆدانی ماڵی عوثمان چل رۆژ بوو، شەهید کردنیشی لە رۆژی هەینیدا بوو، لە رۆژی هەژدەی ذیلحیججەدا بوو، رایەك دەڵێت لە رۆژانی پاش جەژنی قوربان بوو، رایەکیش دەڵێت لە سێی مانگی ذیلحیججەدا بوو، بەڵام راستتر ئەوەیە لە هەژدەی مانگی ذیلحیججەدا بوو، تەمەنیشی هەشتاو دوو ساڵ تێپەڕی کردبوو، هەندێ دەڵێن هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگ، یان دەڵێن هەشتاو چوار ساڵ یان هەشتاو شەش یان هەشتاو هەشت یان نەوەد ساڵ بوو، هەریەك لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی و حەفتاو پێنج ساڵیش هاتووە،

ئیبن حەجەر دەڵێت راستترینیان ئەوەیە لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگیدا شەهید کرا.

سەبارەت بە شوێنی گۆڕەکەشی ئەوەیە کە لە رۆژهەڵاتی بەقیعەوە ئەسپەردە کراوە، رایەك دەڵێت تا سێ رۆژ تەرمەکەی ئەسپەردە نەکرا، رایەکیش دەڵێت تا دوو شەو، رایەکیش دەڵێت هەر یەکەم شەو ئەسپەردە کرا، ئەسپەردەکردنەکەی لەنێوان نوێژی ئێوارەو عیشادا بوو هاودەم بە ژمارەیەکی کەمی هاوەڵان کە حەکیمی کوڕی حیزام و زەیدی کوڕی ثابت و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبیەری کوڕی عەوام و کەعبی کوڕی مالیك و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و ژنەکانی عوثمانی تێدا بوو، شۆردرا و کفن کرا و نوێژی لەسەر کرا، هەندێ لە خەواریجەکان رێیان پێ دەگرتن و دەیانویست تەرمەکەی بەردباران بکەن و دواتر لە گۆڕستانی جوولەکەکان ئەسپەردە بکرێت تا عەلی کەسێکی نارد بۆ لایان و رێگری کرد لێیان، چەند جار هەوڵ درا رێ نەدەن لە گۆڕستانی بەقیعیش ئەسپەردە بکرێت، بۆیە لە دەرەوەی بەقیع ئەسپەردە کرا تا کاتێك موعاویە بوو

بە خەلیفە ئەو دیوارەی نێوانی لابرد، دواتر تەرمی دوو خزمەتکارەکەی عوثمانیشیان هێنا کە کوژرابوون و لەپاڵ عوثماندا ئەسپەردە کران.

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟!

ئەوانیش وتیان ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.

کاتێك سەعد هەواڵی کوژرانی عوثمانی بیست داوای لێخۆشبوونی لای خوا بۆ کرد و سۆزی بۆی جوولآ و ئەم ئایەتەی خوێندەوە (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا) (الكهف: ١٠٣ - ١٠٤)، دواتر سەعد وتی خوایە پەشیمانیان بکەرەوەو دواتر لەناویان بەرە.

رایەك دەڵێت کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا جوبەیری کوڕی موطعیم نوێژی لەسەر کرد، هەندێکیش دەڵێن حەکیمی کوڕی حیزام بووە، هەندێکیش دەڵێن میسوەری کوڕی مەخرەمە نوێژی لەسەر کرد.

## کۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالی و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەروەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرمووده ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانیبێتیان الله تعالی لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمرۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردبیینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالی بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالی ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.



# سەرچاوە

- البداية و النهاية لابن كثير.

- الإصابة في تمييز الصحابة

- العواصم من القواصم.

- أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

- سير أعلام النبلاء للذهبي

- الطبقات الكبرى لابن سعد،

- الإستيعاب في معرفة الأصحاب،

- المعجم الكبير للطبراني،

- السيرة النبوية لابن هشام